

# ڕوڤار

ژمارە ٨٢

ڕوڤار، بڵاوكراوەیەكی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێكی كورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەكات

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی.


سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ١٢٥٠

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
Rovar.sardam@gmail.com
Rovar.facebook.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم




# پێرست

# سەروتار

ئەم ژمارەی ڕۆڤارمان تەرخان کردووە بۆ قانع وەک یەکێک لە دەنگە شیعرییەکانی کورد لە سەدەی ڕابردوودا، قانع لە سەردەمی خۆیدا یەکێک بووە لەو شاعیرە کاریگەرانەی کورد کە خاوەنی خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی بووە، چ لە ڕووی زمانی شیعریی و چ لە ڕووی فۆرم و دارِشتن و شێوازی دەربڕینەوە، بە تایبەت تێما شیعرییەکانی هەمەلایەن بوون و گوزارشت بوون لە خەمی تاک و کۆی ئینسانی کوردی لەو سەردەمەی خۆیدا.
قانع لە ڕوویەکەوە وەک شاعیری چەوساوەکان ناوبانگی درکردووە و یەکێک بووە لە بەرگریکارانی ماف و داخوازییەکانی کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش و هەژار، بەتایبەت جوتیاران و شیعری وەک ئامرازێک بۆ بەرگری لەو چینە و بە گژداچوونەوەی زۆرداریی و دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی بەکار هێناوە، لێرەوە دەبینین دەنگی شیعری قانع ڕاستەوخۆ لە ناوجەرگەی کۆمەڵانی لادێ نشینی کوردەوە چەکەرەی کردووە و شیعرەکانی فەزایەکی گوندییانەیان پێوە دیارە، لە لایەکی ترەوە یەکێک بوو لە ڕووناکبیرە دیارەکانی ئەو سەردەمە کە هۆشیاریی چینایەتی لە ناو خەڵکیدا بڵاوکردۆتەوە و چەند جارێک بەو هۆیەوە زیندانی کراوە.
قانع بەو پێیەی کەسێکی خوێندەوار و وشیار بووە، زۆر باش درکی بە خەم و ئازاری کۆمەڵانی خەڵک کردووە و زیرەکانە چووەتە ناو قووڵایی ئەندێشە و خەم و ئازارەکانیان، هاوکات بە زمانێکی سادە و ڕەوان و دوور لە هەر جۆرە ئاڵۆزییەکی تەکنیکی و زمانەوانی شیعرەکانی خۆی دارِشتووە، ئەمەش وای کردووە لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکی لادێ نشینەوە بەتایبەت جوتیاران و هەژاران شیعرەکانی وەربگیرێن و لێی تێبگەن و چێژی لێ ببینن، ڕەنگە تا ئێستاش شیعری قانع بە سەر زمانی گەلێک لەو نەوە و بە نەوەی داهاتووەوە بێت.
تاکو ئێستا لە چەندین وتار و لێکۆڵینەوەدا لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و شارەزا و ڕەخنەگرانەوە توێژینەوەی هەمە لایەن لەسەر شیعرەکانی قانع کراوەو و وەک دەنگێکی دلێر و وشیارکەرەوەی کۆمەڵانی خەڵک بە تایبەت گوند نشینان و وەک دەنگێکی بەرەنگاریی خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی ناوزەد کراوە، ئێمەش لە ڕۆڤارەوە کە ئەم ژمارەیەمان بۆ قانع تەرخان کردووە، دەرگامان بە ڕووی کۆمەڵێک نووسەر و توێژەر و ڕەخنەگردا کردووەتەوە بۆ ئەوەی تێڕوانین و سەرنجی خۆیان لەسەر دنیای شیعریی قانع بخەنە ڕوو، دەخوازین ئەم ڕۆڤارە ببێتە سەرچاوەیەکی بە کەڵک بۆ ئەو خوینەرانەی کە دەیانەویت قانع و دنیای قانع وردتر بناسن و ئاشنا بن بە ژیان و دنیای شیعرەکانی.

**سکرتێری نووسین**



# ژیاننامەی قانع

ناوی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ سەعیدی دۆڵاشییە و لە نەوەی (کابل)ی مەریوانن. لە 15ئەیلولی 1898 لە گوندی ریشێن-ی بناری شارەزوور لەدایک بووە. لە تەمەنی 40 رۆژیدا بوو کە باوکی کۆچی دوایی کردووەو لە تەمەنی دوو ساڵیشدا دایکی کۆچی دوایی کردووە. ژیانی قانع لە زەمینەیەکی دەربەدەری و پڕ لە کوێرەوەرییەوە دەستی پێکرد.

به هەتیوی لەلای خزمێکیان کە ناوی "ئاغا سەید حوسێنی چۆڕی" بووە لە ناوچەی مەریوان گەورە بووە و هەر ئەویش ناویەتە بەر خوێندن. پاشان بە فەقێیەتی چووە بۆ سلێمانی و چەند ساڵێک لەوێ ماوەتەوە. هەر بەمەبەستی گەڕان بە شارەکانی کوردستان دا بۆ خوێندن، چۆتە "سنە و مەریوان و سابڵاخ و بۆکان و شنۆ و هەولێر و کۆیەو کەرکوک و سلێمانی و بیارە". دوا قۆناغی خوێندنیشی لە مەریوان تەواو کردووە.

قانع بەرلەوەی بەتەواوی فێری خوێندن و نووسین ببێت توانای شاعیریێتی تیا دەرکەوتووە و لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا خووی داوەتەوە شیعری ئاینی.

دواتر بەهۆی بارودۆخی کوردستانەوە خولیای شیعری نیشتمانپەروەری هەبووە.

خوێندنەوەی کتێبێکی دەستنووسی فارسی بەناوی "وقائع ال اردەلان" کە باسی راپەرینەکانی تیرەی ئەردەڵانییەکان ئەکات بەرامبەر داگیرکەران، هێندەی تر کار ئەکاتە سەر دەروونی شاعیر و بەرهەمە شیعرییەکانی و ئیتر ئەبێتە شاعیرێکی نەتەوایەتی و نیشتمانپەرەوەر.

لایەنە لەیەکنەچووەکانی شیعرەکانی شاعیر، ئەوە ئەگەیەنێ کە زادەی فیکری یەک سەردەم و پێویستی یەک قۆناغ و بەرهەمی یەک ئێش و ئازار نین، بەردەوام باوەڕی بە یەکگرتنی جەماوەرو یەکسانی کۆمەڵایەتی هەبووە و لە سەرەتای چلەکانەوە بە تایبەتی لە ڕۆژگاری دووەمین جەنگی جیهانیدا، ڕێبازی سۆشیالیستی وەکو دیاردەیەکی سیاسیی زیندوو لەناو شیعرەکانیدا ڕەنگی دایەوە و لە سەنگەری شیعری شۆڕشگێرانەدا دژی دەرەبەگی چەوسێنەرو ئیمپریالیزم بووە و هەمیشە دڵی لەگەڵ ئازار و ئاواتی مرۆڤی جووتیاری چەوساوەی کورددا بووە و وەک شاعیرێکی دڵسۆز و خەمخۆری کورد شیعری بۆ نەتەوەی کورد هۆنیتەوە و لەگەڵ بەسەرهات و کارەسات و راپەرین و شۆرش و دەستکەوتەکانی کورددا ژیاوە.

لەشیعرەکانیدا داوای مافەکانی ژنانی کردووە لەبوارەکانی رۆشنبیری وکۆمەڵایەتی و ئابووریدا.

قانع لە سەرەتای پەنجاکاندا بە هاوکاریی مامۆستایان "عەلادین سەجادی و شوکر مستەفا" توانی پێنج بەش لە شیعرەکانی بە شێوەی دیوانی جیا جیا و قەوارەی تایبەتی چاپ بکات، کە ئەم بەرهەمانەن "گوڵاڵەی مەریوان، باخچەی کوردستان، چوارباخی پێنجوێن، شاخی هەورامان، دەشتی گەرمیان".

لە ژیانیدا گەلێ کارو پیشەی کردووە، لەوانە مامۆستای قوتابخانەو کرێکاری و مامۆستای مزگەوت و جووتیاری و ئاشەوانی و فەرمانبەرێتی. لەکۆتایی پەنجاکاندا چەند جارێک خراوەتە بەندیخانە. لە ساڵی 1960دا لە بەندیخانەی سلێمانی چۆنیەتی نووسینی زمانی کوردی فێری زیندانییەکان کردووە.

لە 1963دا لەگەڵ وریای کوڕیدا لەبەندیخانەی "قەجەر"ی تاران، زیندانی ئەکرێ و هەر لەو بەندیخانەیەدا هۆنراوە بەناوبانگەکەی نووسیوە کە دەڵێ:

**ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە**
**ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە**



# قانع لە ساڵە درێژەکانی سەدەی بیستەمدا
# پەیوەندیی نێوان شیعر و نەتەوە و خۆرئاوا

## مەریوان وریا قانع

١

قانع یەکێکە لە ناوە گرنگەکانی سەدەی بیستەمی مێژووی ڕۆشنبیری و ئەدەبیاتی کوردیی. ئەم شاعیرە شەست و حەوت ساڵ ژیا و  لە دوای خۆی ژمارەیەکی زۆر شیعر و سەربردە و ڕووداوی سەرنجڕاکێشی بەجێ هێشتووە. ئەم نووسینە هەوڵدانە بۆ کێشانی وێنەیەکی گشتیی ئەزموونی شیعریی ئەم شاعیرە و نیشاندان و خوێندنەوەی ئەو پرسیار و خەون و مەترسییانەی ئەدەبی ئەم پیاوە پێیانەوە دەرگیربووە. هەروەها هەوڵدانێکە بۆ بەستنەوەی ئەزموونی ئەدەبیی ئەم شاعیرە بە شاعیرانی پێش خۆی و نیشتەجێکردنی ئەو ئەزموونە لەناو ئەزموونی ئەو نەوە ئەدەبییە تایبەتەدا کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دێتەکایەوە. وەک ئاشکرایە قانع ساڵی ١٨٩٨ لەدایک بووە و ساڵی ١٩٦٥ کۆچی دوایی کردووە. ئەگەر لە پەنجا ساڵی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕۆشنبیریی نوێی ئێمە، بە پلەی یەکەم، لە ڕێگای

حاجی قادریی کۆییەوە تەعبیری لە خۆی کردبێت، ئەوا لە پەنجا ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ئەم ڕۆشنبیرییە لە ڕێگای قانعەوە ئەم کارەی کردووە. قانع لەم فەزا ڕۆشنبیرییەدا هێما نییە تەنها بۆ تاکەکەسێکی تایبەت، یان بۆ نووسەرێک بە تەنها، بەڵکو هێمایە بۆ نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبریی تایبەت و بۆ لەدایکبوونی کۆمەڵێک گوتاری تازە سەبارەت بە چییەتی ئەدەب و پەیوەندیی نێوان ئەدەب و کۆمەڵگا و ئەدەب و کوردبوون و ئەدەب و ئاینده لە کوردستاندا. ئەم نووسینە هەوڵدانە بۆ چوونە ناو دونیای قانعەوە لە ڕێگای بەستنەوەی ئەزموونە ئەدەبی و تاکەکەسییەکەیەوە وەک مرۆڤێک لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، بەو گشتە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییە ئاڵۆزە تازەیەوە کە لەو ڕۆژگارەدا دروست دەبێت.

## ٢

ڕێکەوتێکی سەیرە قانع ڕاستەوخۆ لە دوای کۆچکردنی حاجی قادری کۆییەوە لە ساڵی١٨٩٧دا لەدایک دەبێت، لەو کاتەدا کە حاجی قادر ماڵئاوایی لە ژیان و لە ئەدەبیاتی ئێمە دەکات، قانع دێتە دونیاوە و دەبێت بە یەکێک لە ناوە گرنگەکانی ئەدەبیاتی قۆناغی دوای حاجی قادری کۆیی. ڕێکەوتەکە بە شێوەیەکە وەک ئەوەی قانع هاتبێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو "بۆشاییە ئەدەبیی"ە کە مەرگی حاجی قادری کۆیی لە دونیای ئێمەدا دروستی دەکات. قسەکردن لە "پڕکردنەوەی بۆشایی" لەو ڕاستییەوە دێت کە ئەزموونی حاجی قادری کۆیی ئەزموونێکی دەگمەنە لە سەدەی نۆزدەیەمی ئەدەبیاتی ئێمەدا، هەوڵی یەکەمی تازەکردنەوەیەکی تایبەتیی ئەم ئەدەبیاتە و بارگاویکردنێتی بە زمان و خەون و خواست و ئەرکی ئەدەبیی تازەوە، کە بەر لە حاجی قادر بوونیان نەبووە. ئەوانەی شارەزای ئەزموونی شیعریی حاجی قادری کۆیین، دەزانن پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان ئەم ئەزموونە و ئەزموونی شیعریی قانعدا هەیە. دونیابینی و تێگەیشتنی قانع بۆ ئەدەب بەگشتی و بۆ شیعر بەتایبەتی، لە زۆر ڕووەوە بەردەوامیی دونیابینی حاجی قادری کۆییە، زمانی تەعبیرکردنی شیعر لە خۆی، پەیوەندیی شیعر و کۆمەڵگا، ئەو بابەتانەی کە دەبن بە بابەتی شیعر و ئەو خەڵکەی کە شیعر ڕوویان تێ دەکات لای قانع، لە زۆر ڕووەوە درێژکراوە و گەشەدانە بە برێک لەو شتانە لای حاجی قادری کۆیی.

قانع بەم مانایە حاجی قادریی کۆیی سەدەی بیستی ئەدەبیاتی ئێمەیە. بەڵام هاوکات کۆمەڵێک "دابڕانی گەورە"ش لە نێوان دونیابینیی حاجی قادری کۆیی و دونیابینیی قانعدا لە ئارادایە کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە وردی لە سەریان دەوەستین. ئەوەی ئەم دوو شاعیرە بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە لەدایکبوونی جۆرێک لە جیهانبینیی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی تازەیە کە لە دەیەکانی دوای سەدەی نۆزدەهەمەوە دێت و لەناو بەشێکی گرنگی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی ئەدەبیاتی ئێمەدا گەشە بە خۆی ئەدات و ئەمێنێتەوە. ڕوانینێکە بۆ چییەتی و ڕۆڵی ئەدەبیات لەناو گشتێتی ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی کۆمەڵگادا. بێگومان چۆنێتیی کارکردن بەم ڕوانین و جیهانبینییە تازەیە و شێوازی تەرجەمەکردنی بۆ شیعر و ئەدەبیات لای هەر شاعیرێک لە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە بە جۆرێکی جیاوازە، بەڵام لە ئاستی ڕوانینێکی گشتیدا بۆ دونیا و بۆ ئەدەبیات چەندان خاڵی هاوبەشیان هەیە. دەکرێ کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئەو جیهانبینییە هاوبەشە تازەیە لەم چەند خاڵەدا کۆبکەینەوە:

١-هەستکردن بەوەی لە دونیاییەکی تەواو جیاوازدا دەژین لە دونیای نەوەکانی بەر لە خۆیان و ئەزمونکردنی ئەو دونیا تازەیەش وەک سەرزەمینی کۆمەڵێک مژدە و خەونی گەورە، بەڵام هاوکات سەرزەمینی کۆمەڵێک مەترسی و هەڕەشەی بنەڕەتیی ئێستایی و ئایندەیی.

٢- هەستکردن بە لەدایکبوونی چوارچێوەی



ڕۆڤار

سیاسیی و فەرهەنگیی نوێ بۆ ڕێکخستنی ژیانی پێکەوەیی بە کۆمەڵ، جیاواز لەو چوارچێوە تەقلیدییە دینییەی کە بۆ چەندان سەدە پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتیی تاکەکەس و میللەتانی ناوچەکەی ڕێک خستووە. هەستکردن بەوەی کە بوونەوەرێکی جیاواز و تایبەتیی ناو ئەم چوارچێوە تەقلیدییەیت و پێویستت بە چوونەدەرەوە لە سەرلەبەری چوارچێوەکە هەیە. ئەم هەستکردنە لە زۆر سەرەوە هەستکردنە بە "کۆتاییهاتنی ئیمپراتۆریەتە دینییەکان" وەک چوارچێوەی گشتیی جێکردنەوەیان بە "چوارچێوەی نەتەوەیی و نیشتیمانی".

٤- دروستبوون و ناسینی "ئەوی تر" ی نوێ و کردنی ئەم "ئەوی تر"ە بە چوارچێوەیەکی گرنگ بۆ تەماشاکردنێکی نوێی خود خۆی و سەرلەنوێ نرخاندنەوەی شێوازیی ژیان و ئامادەبوونی ئەم خودە لەناو دونیا و پەیوەندییەکاندا. بوونی ئەم "ئەوی تر"ە تازەیە بە هێزێکی نوێ بۆ "خودناسیی" و "خودسازیی" گۆڕانکاریی لە ڕێگای بەراوردکردنەوە. ئەم "ئەوی تر"ەش ئەوروپا و ئەزموونی پێشکەوتنی ئەوروپییە وەک شارستانیەتێکی نوێ و وەک شێوازی ڕێکخستنی نوێی پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە خۆی و بە دەوروبەر و بە کولتور و بە زمان و بە زانستەوە.



٥- ڕەخنەکردنێکی هەمەلایەن و فرەشێوەی "خود" خۆی، خود وەک یەکەیەکی سیاسی و فەرهەنگی و دینی و ڕەمزیی. خود وەک پەیوەندیی بە دونیای ئەمڕۆوە و وەک پەیوەندیی بە ڕابردووەوە.

٦- کردنەوەی "ڕەهەندێکی ئایندەیی" گرنگ لەم خودەدا و گۆڕانی "ئێستا" بۆ کێشەیەکی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی هەنووکەیی. ڕزگارکردنی ئایندە لە مانا دینییەکانی و گۆڕینی بە زەمەنێک کە مانای شارستانی و مادی و فەرهەنگی و سیاسیی هەیە، کردنی ئەمانەش بە کێشە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا کە ئەرکی ڕۆشنبیران و خوێندوارانە بەرزیان بکەنەوە بۆ ئاستی کردنیان بە مەسەلە هەرە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا و بە ڕەهەندێکی هەرە گرنگی ئەو ئەدەبیاتەشی کە دەینووسن.

٧- مامەڵەکردنێکی تایبەتی زمان و دۆزینەوەی پەیوەندی نوێ لە نێوان زمان و شوناس و زمان و کۆمەڵگادا. ئەم مامەڵەکردنە تازەیەی زمانیش جۆرێک لە پراکتیکی تایبەتیی زمانە بە کۆمەڵێک مانای ئایدیۆلۆژیی تازەوە. لە پێش هەمووانیشەوە دروستکردنی نەتەوە و نیشتیمان و تاکێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی بەئاگا لە زماندا. ئەم مەسەلەیەیە نیشانمان ئەدات چ جیاوازییەکی گەورە لە نێوان زمانی نالی و مەحوی و حاجی قادری کۆییدا هەیە و دەتوانێت ماناکانی ئەو ئەو جیاوازییانەشمان بۆ لێک بداتەوە.

با کەمەکێک وردتر لە سەر ئەو تەوەرە سەرەکییانەی ئەو دونیابینییە نوێیە بوەستین.

## ٣

هەستکردن بەوەی کە دونیایەکی تازە لە دروستبووندایە و شیعر و ئەدەبیاتی کوردیش، هاوشان بە مرۆڤ و کۆمەڵگای کوردیی، لەو دونیا نوێیەدا دەژین هەستی سەرەکیی ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی ئێمەیە، چ لای حاجی قادریی کۆیی و چ لای ئەو شاعیرانەی تر کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەنووسن، لە پێش هەموانیشەوە قانع. لە حاجی قادری کۆییەوە هەستێکی گەورە بە تازەبوونەوەی دونیا و تازەبوونەوەی پەیوەندییەکان و تازەبوونەوەی شوناسەکان لە ئارادایە. هۆشیارییەک ئامادەیە ئاگادارە بەوەی چوارچێوەی نوێ بۆ کۆکردنەوەی مرۆڤەکان و بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و بۆ خۆناسین و بۆ ئەوی تر-ناسین دروست بووە. دونیایەک هاتۆتە کایەوە پێویستی بە گۆڕینی زمان و گۆڕینی

باوەڕ و گۆڕینی پەیوەندی و گۆڕینی خەونەکانە. هاوکات ئەم دونیا تازەیە پڕ بووە لە هەڕەشە و مەترسیی نوێ کە لە قۆناغەکانی پێشتری مێژووی ئێمەدا بوونی نەبووە، بۆ نموونە هەڕەشەی جیهانێکی تەواو لە سەرجەمی میللەتانی ناوچەکە و لە سەرجەمی دونیای شارستانی، مەترسیی دۆڕاندنی زاد و نیشتیمان و وڵات.

بەبۆچوونی من، گرنگترین دەرکەوتێکی ناو ئەم دونیا تازەیە بریتییە لە "لەدایکبوونی نەتەوە"، نەتەوە وەک بوونەوەرێکی تازە کە بەبێ پرسکردن بە هیچ کەس و لایەنێک هاتۆتە ناو ئەم دونیا تازەیەوە و لەگەڵ خۆشیدا دەسکاریی شێوەژیان و شێوەبیرکردنەوە و شێوەنووسین و شێوازی ئامادەبوونی مرۆڤ و میللەتان لەناو دونیادا دەکات. نەتەوە وەک گروپێکی سیاسی و فەرهەنگی و ئەخلاقیی تایبەت، کە خۆی بە هەڵگری کۆمەڵێک تایبەتمەندیی ئەتنی و کولتوری و ڕەمزی دەزانێت و پێی وایە لە سەر بنەمای ئەم تایبەتمەندێتی و جیاوازبوونەش مافی هەبوونی کۆمەڵێک داواکاری سیاسیی هەیە، لە پێش هەموانیشەوە مافی ژیانێکی سیاسیی سەربەخۆ. نەتەوە تەنها یەکەیەکی سیاسیی نییە، کورت ناکرێتەوە بۆ داواکارییەکی سیاسیی بە تەنها، نەتەوە هاوکات یەکەیەکی کولتوری و ڕەمزی و ئەدەبییە. هەڵگری ڕوانینێکی تازەیە بۆ زمان، زمان وەک ئامرازی تەعبیرکردنی نەتەوە لە خۆی، وەک یەکەی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە دونیاوە. لە ئەدەبیاتی ئێمەدا نەتەوە بەم مانایە بۆ یەکەمجار لەگەڵ ئەزموونی ئەدەبیی حاجی قادری کۆییدا لەدایک دەبێت. ئەزموونی ئەم شاعیرە، بەتایبەتی لە دوای ئاوارەبوونییەوە بۆ ئەستەمبوڵ، ئەزموونی دروستکردنی نەتەوەیە بە شیعر. بنیادنانی نەتەوەیە لەناو زمان و وێنە و خەیاڵ و چاوەڕوانییەکانی مرۆڤی ئێمەدا. دروستکردنی هەستکردنە بەو یەکە سیاسییە مێژووییە لەناو داوەریکردنە ئەخلاقی و دینی و فەرهەنگییەکاندا و بوونی نەتەوە خۆشیەتی بە یەکەی سەرەکیی ناو ئەو چوارچێوە تازانە.

سەرەتاکانی لەدایکبوونی کورد وەک نەتەوە لە شیعریی حاجی قادری کۆییەوە دەست پێ دەکات و لە دوای ئەوەوە بۆ ناو بەشی هەرە زۆری ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمی ئێمە دەگواسترێتەوە. لە دوای حاجی قادری کۆییەوە ئەدەب لە دونیای ئێمەدا دەبێت بە یەکێک لە ئامرازە سەرەکییەکانی دروستکردنی نەتەوە و لە ئەدەبیاتی قانعیشدا ئەم گۆڕانە ڕووبەرێکی گەورەی ئەزموونە شیعرییەکەی ئەم شاعیرە داگیر دەکات. شیعری قانع لە ئەزموونی دروستکردنی نەتەوەدا واز لەو کەلەپوری نووسینە دەهێنێت کە شیعر و ئەزموونی ناوەکیی شاعیرەکە بەیەکتری یەکسان دەکات، یان ئەم "ئەزموونە ناوەکیی"ە تەواو دەگۆڕێت و باس لە لەدایکبوونی "جۆرێکی نوێ لە ناوەکیبوون" و جۆرێکی نوێ لە "هەست و نەستی تایبەت" دەکات کە ناچێتەوە ناو ئەو سیستمە بەلاغییە تەقلیدییەوە کە مێژووی چەند سەدەیەکی درێژ ئاراستەی دەکات.

لە ئەزموونی قانعدا شیعر دروستکەر و بونیادنەری ژمارەیەکی نەتەوەیە. شیعر هێزی دروستکردنی ئەو "خودە دەستەجەمعی"یە تازەیە کە بەیانکردن و داهێنانی، پێویستی بە دروستکردنی جۆرێکی نوێ لە زمان و جۆرێکی نوێ لە تێگەیشتن لە شیعر و جۆرێکی نوێ لە پەیوەندی نێوان شیعر و کۆمەڵگا و شیعر و مێژوو هەیە، وەک چۆن پێویستی بە جۆرێکی نوێ لە تاکەکەس هەیە کە لەناو ئەم گشتە گەورە و ئاڵۆزەدا لەدایک ببێت و ببێت بە "جەماوەر"ی ئەو شیعرە. گۆڕانەکە لێرەدا گۆڕانێکی دوو جەمسەرەیە، لە سەرێکەوە خەیاڵ و هۆشیاریی ئەدەبیی شاعیرەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە سەرێکی دیکەوە ئەو کەسانەی کە شیعرەکانیان ڕووبەڕوو دەکرێتەوە و وەک "جەماوەرێکی ئەدەبیی نوێ" وێنا دەکرێن گۆڕاون و هەوڵی دروستکردنی



بەردەوامیان دەدرێ. بەمجۆرە ئەدەبیاتی ئێمە لە حاجی قادری کۆییەوە، بەتایبەتیش لای قانع، دوو ئەرکی سەرەکیی دەکەوێتە سەر شان، یەکەمیان ئەرکی دروستکردن و داهێنانی نەتەوەیە وەک خودێکی دەستەجەمعیی مۆدێرن. دووهەمیان ئەرکی دروستکردنی تاکەکەسێکە ئامادەبێت ئەو نەتەوەیە لەناو خۆی و لەناو دونیا و لەناو پەیوەندی و هۆشیاری و خەیاڵیدا دروست بکات و لەم پرۆسەیەشدا تەماهی تەواو لەگەڵ ئەو دروستکراوە نوێیەدا بکات.

لەم ئەزموونەدا شیعر نابێت بە نیشتمانی ڕۆحێکی تاکەکەسیی غەمبار و پڕ پرسیار، بۆ نموونە وەک لە ئەزموونی "مەحوی"دا ئامادەیە، بەڵکو دەبێت بە ئامرازێکی گرنگی دروستکردنی نیشتیمانێک لەناو دونیایەکی تازەدا، کە هەبوونی نیشتیمان لەو دونیایەدا بەشێکی هێجگار گرنگ و سەرەکیی شوناسی مرۆڤە. شیعر لای قانع ئامرازی پاراستنی هاوسەنگیی ناوەکیی نێوان شاعیر و دونیا و شاعیر و گەردوون نییە، بەڵکو ئامرازی جێکردنەوەی کۆمەڵێک مرۆڤە لەناو دونیایەکی تەواو تازەدا. بەشێکی گرنگی ئەزموونی شیعریی قانع لە پەیوەندییەکی پتەودایە بەجێبەجێکردنی ئەو دوو ئەرکە سەرەکییەی لە سەرەوە باسم کردن.



ئەگەر دروستکردنی نەتەوە لە شیعردا و دوای ئەوەش گواستنەوەی لە شیعرەوە بۆ ناو دونیا یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیاتی ئێمە بێت لە سەردەمی حاجی قادری کۆییەوە، پرسیار ئەوەیە ئایا بیرۆکەی نەتەوە لە دونیای ئێمەدا لە چ جۆرە سەردەمێکدا لەدایک دەبێت؟ ئەو ڕوانین و ئایدیۆلۆژیا و پرۆژە سیاسییانە کامانەن کە لە ساتەوەختی لەدایکبوونی نەتەوەدا لەو بەشەی دونیادا ئامادەیە؟ ئەدەبیاتی ئێمە لەم دونیا تازەیەدا چ جۆرە گۆڕانێک بە خۆیەوە دەبینێت و ئایا جیاوازیی نێوان ڕوانینی حاجی قادری کۆیی و ڕوانینی قانع بۆ نەتەوە چییە و دەرەنجامەکانی ئەم جیاوازییە چییە و کامەیە؟

## ٤

ئەو ئایدیۆلۆژییانەی حاجی قادر لە دواهەمین چارەکی سەدەی نۆزدەهەمدا دەیانناسێت و لە پاڵیاندا بیر لە دروستکردنی نەتەوە دەکاتەوە، پێنج ئایدیۆلۆژیای سەرەکین. سیانیان هیی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خۆین و دوانەکەی تریشیان ئایدیۆلۆژیای خۆرئاوایین. ئایدیۆلۆژیاکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکە بریتین لە "عوسمانیزم" و "پان ئیسلامیزم" و "ناسیۆنالیزمی کولتوریی". دوو ئایدیۆلۆژیا دەرەکییەکەش بریتین لە "پۆزەتیڤیزم" و "داروینیزمی کۆمەڵایەتیی". ئەوەی سەرزەمینی بیرکردنەوەی حاجی قادر دەستنیشان دەکات ئەو پەیوەندییانەیە کە ئەم شاعیرە لەگەڵ ئەم ئایدیۆلۆژیایانەدا دروستیان دەکات. یەکێک لە پرسیارە گرنگەکانی دواهەمین چارەکی سەدەی نۆزدەهەم ئەوەیە مرۆڤ چۆن لەو ساتەوەختە تایبەتەی مێژوودا پێناسەی خۆی بکات؟ ئینتیما کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی بۆ چی و بۆ کێ دەبێت؟ کامەیە ئەو چوارچێوە سەرەکییەی دەتوانێت ئەندامانی گروپێکی دیاریکراو لەناو سنوورەکانیدا کۆبکاتەوە؟ لەناو ئیمپراتۆریەتیی عوسمانیدا وەڵام بەو پرسیارانە بریتین لە "عوسمانیزم" و "پان ئیسلامیزم" و "ناسیۆنالیزمی کولتوری".

عوسمانیزم مانای وێناکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سوڵتانەکەی وەک چوارچێوەی سەرەکی شوناسی دەستەجەمعی و بینینی سوڵتانی عوسمانی وەک ڕەمزێک کە هەموو موسڵمانەکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکە بتوانن لە دەوری کۆببنەوە. بەپێی ئایدیۆلۆژیای عوسمانیزم هەموو ئەوانەی لە چوارچێوەی ئەو ئیمپراتۆریەتەدا دەژین و وەلایان بۆ سوڵتان هەیە،

شوناسی سەرەکییان شوناسێکی عوسمانییە، کورد و عەرەب و تورک و نەتەوەکانی تر، هەموویان عوسمانین و ئەوەی شوناسی ئەوان دەستنیشان دەکات عوسمانیبوونە. هەرچی "پان ئیسلامیزم"ە وەک ئایدیۆلۆژیا هەڵگری شوناسێکە فراوانترە لە شوناسی عوسمانیزم، ئەوەی لە پان ئیسلامیزمدا شوناسی مرۆڤ و گرووپەکان دەکات، ئینتیما نییە بۆ سوڵتانی عوسمانی بەتەنیا، بەڵکو ئینتیمایە بۆ ئیسلام وەک دینێکی گەردوونی. چوارچێوەی سەرەکیی خۆناساندن لێرەدا چوارچێوە سیاسی و دینی و ڕەمزییەکانی "ئومەی ئیسلامی"یە وەک شوناسێکی گەردوونی.

سێهەمین ئایدیۆلۆژیاش بریتییە لە ئایدیۆلۆژیای "ناسیۆنالیزمی کولتوریی" کە بانگەشەی ئەوە دەکات هەر گروپێکی ناو ئیمپراتۆریەتەکە دەشێت "شوناسێکی کولتوری" و "ئەتنی"ی جیاوازی هەبێت کە لە شوناسی ئەتنییەکانی تری ناو ئیمپراتۆریەتەکە جیاواز بێت، شوناسێک هەستی



ئەوە بە ئەندامانی ئەو ئەتنیە بدات کە خۆیان بە خاوەنی زمان و کولتور و بەها و نۆرمی تایبەت بزانن، بەڵام هیچ یەکێک لەمانە نابنە بەهانەیەک بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و جیاواز لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خۆی. ناسیۆنالیزمی کولتوری، ناسیۆنالیزمی داننانە بە جیاوازییە کولتوری و ئەتنییەکاندا بەڵام بەبێ بەستنەوەی ئەم داننانە کولتوری و ئەتنییە بە داواکاریی سیاسییەوە. لەم دۆخەدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەبێت ئەو چوارچێوە سیاسییە بێت کە شوێنی چەندەها شوناسی ئەتنی و کولتوریی جیاوازیی تێدا دەبێتەوە.

ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا و لە پەیوەندیدا بە ئەزموونی حاجی قادری کۆییەوە ڕوودەدات، ئەوەیە حاجی قادر ناچێتە ناو هیچ یەکێک لەم سێ ئایدیۆلۆژیا و پرۆژە ئیمپراتۆرییە سەرەکییانەوە. حاجی قادر نە بەرگریی لە عوسمانیزم و پان ئیسلامیزم دەکات، نە داواکارییەکانیشی لە سنووری داواکاریی ناسیۆنالیزمی کولتوریدا سنووردار دەکات. حاجی قادر پرۆژەی دروستکردنی نەتەوەیەکی سیاسی دەهێنێتە کایەوە و داوای دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکات. ئەم داواکاری و ئەم گۆڕانکارییە لە بیرکردنەوە و ڕوانیندا پەیامی ژمارەیەکی ئەزموونی حاجی قادری کۆییە، بنەمای سەرەکیی هۆشیاریی ئەدەبی و شیعری و دوای ئەوانیش هۆشیاریی سیاسیی ئەم شاعیرەیە. ئەم گۆڕانانەش تەواو تازە و بێ پێشینەن لە دونیای ئەدەبیی ئێمەدا.

بۆ یەکەمجار لە دونیای ئێمەدا پەیوەندییەکی بەهێز و فرەلایەن لە نێوان هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە لایەکەوە و هۆشیاریی ئەدەبی لە لایەکی دیکەوە دروست دەبێت، خەونی دەسکاریکردنی دونیا و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیا باڵادەستەکانی کۆتایی سەدەکە، دەبێت بە ڕەگەزێکی ناوەکیی هۆشیاریی شیعری

و هۆشیاریی سیاسیی ئەم شاعیرە بەرامبەر بە دونیا. هەنگاوە سەرەکی و سەرەتاییەکانی تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی ئێمە لەم گۆڕانکارییە گرنگەوە دەستپێ دەکات. هەردوو ئایدیۆلۆژییا خۆرئاواییەکەش بەشێوازی جیاواز لای بەشی هەرە زۆری ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە ئامادەیە، لە ئەزموونی حاجی قادردا پێداگرتن لە سەر خوێندن و فێربوون و ڕۆڵی زانست لە تازەبوونەوەدا و پێداگرتن لە سەر مەسەلەی دروستکردنی دەوڵەت وەک یەکەیەکی سیاسیی بەهێز و مۆدێرن، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەو دوو ئەزموونەوە هەیە.

هەرچی پرۆژەی ناسیۆنالیزم هەیە، لە سەدەی بیستەم و لە ساتەوەختی هاتنی قانعدا دەچێتە پەیوەندییەوە لەگەڵ چوار ئایدیۆلۆژییا و چوار پرۆژەی سیاسیی جیاوازەوە لەو پرۆژانەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئامادە بوون. ئەزموونی ئەدەبیاتی قانع لە بەردەم ئامادەگیی چوار ئایدیۆلۆژیا گەورەکەی سەدەی بیستەمدا دروست دەبێت کە بریتین لە ، ئایدیۆلۆژیاکانی لیبرالیزم و سۆسیالیزم و فاشیزم و ئیسلامیزم، کە لەناو هەریەکێکیاندا و بە بڕ و ڕادەی جیاواز شتێک یان لە پۆزەتیڤیزم یان لە داروینیزمی کۆمەڵایەتیی ئامادەیە. ئەوەی شایانی باسکردنە نە لیبرالیزم و نە ئیسلامیزم شوێن-پێی خۆیان لەناو ئەدەبیاتی ئێمەدا بەگشتی و لەناو شیعری قانعدا بەتایبەتی، ناکەنەوە و بیرۆکەی نەتەوە خۆشی، چ لەناو ئەزموونە ئەدەبییەکان و چ لەناو واقیعی سیاسیدا، بە دوو ئاقاری دروستکردنی نەتەوەیەکی لیبرال و نەتەوەیەکی ئیسلامیدا ناڕاوت.



لیبرالیزم لەبەرئەوەی لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە بە ئەزموونی کۆڵۆنیالیزمەوە، ئیسلامیزمیش بەهۆی ئەوەوە کە پێگەیەکی ئایدیۆلۆژیی بەهێزی لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا نەبووە، نەچوونەتە پەیوەندییەوە بە دروستکردنی نەتەوەوە. یانی پرۆژەی دروستکردنی نەتەوە نە پرۆژەی دروستکردنی نەتەوە و دەسەڵاتێکی لیبرال، نە پرۆژەی دروستکردنی دەسەڵاتێک دینیی کە هەوڵی سەپاندنی شەریعەت بدات و خەمی یەکەمی پرۆسەی بە ئیسلامیکردنی کۆمەڵگا بێت.

لە باتی ئەم دوانە فاشیزم و سۆسیالیزم دەبنە چوارچێوەی ئەزموونی ئەدەبی و سیاسیی برێک لە ناوە گرنگەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە دونیای ئێمەدا. ئەگەر فاشیزم لە قۆناغێکدا لای نووسەرێکی گرنگی وەک ڕەفیق حیلمی ئامادە بێت، ئەوا سۆسیالیزم دەبێت بە یەکێک لە دەرکەوتە هەرە گرنگەکانی ئەزموونی ئەدەبیی قانع.

پرۆژەی تازەکردنەوەی کوردستان، مۆدێرنکردنەوەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی، بیناکردن و دروستکردنی نەتەوە لە شیعر و دەرەوەی شیعردا، پرۆژەی گۆڕینی شیعر بۆ ئامرازی درستکردنی نەتەوە و بۆ وزەی دروستکردنی تاکەکەسێکی نەتەوەیی، هەموو ئەمانە لای قانع، دەچنە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆوە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستیدا. لای قانع ناسیۆنالیزم لە پەیوەندییەکی پتەودایە بە سۆسیالیزمەوە، سۆسیالیزمیش ئەوەندەی ڕەهەندێکی دادپەروەر و پۆزەتیڤیزمانەی گرنگ وەردەگرێت، ئەوەندە وەک ئایدیۆلۆژیایەکی گشتگیر ئامادە نییە کە هەموو کون و قوژبنێکی ژیان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

سۆسیالیزم لە ئەزموونی قانعدا ناوێکی ترە بۆ تێکەڵەیەکی تایبەت لە بیرۆکەی پێشکەوتن و یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، یان بۆ کۆتاییهێنان بە هەڵاوێردی دینی و سیاسی و فەرهەنگی و ئایدیالێک بۆ کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو و دادپەروەر. جگە لە مانە سۆسیالیزم لە شیعری قانعدا وزەیەکی مێژوویی نوێیە بۆ گۆڕان،

هێزێکە مرۆڤ لە ناوەوەڕا تازە دەکاتەوە و وای لێ دەکات ببێت بە سەروەری ژیان و سەروەری چارەنووس و سەروەری مێژووی خۆی. بە کورتی سۆسیالیزم ناوێکی ترە بۆ دونیایەکی پاکتر و نەرمتر و مرۆڤانەتر، خەونێکە بۆ گۆڕان، پەیامێکە بۆ پەڕینەوە بەرەو سبەینێیەکی باشتر.
ناوەرۆکی نەتەوە خۆشی، لە شیعری قانعدا، لە سەر بنەمای ئەم ڕوانین و تێگەیشتنە بۆ سۆسیالیزم دەستنیشان دەکرێت. نەتەوە لای قانع پرۆژەی هێزەکانی خوارەوەی کۆمەڵگایە، پرۆژەی جوتیاران و کرێکاران و ڕەنجدەران و پاڵە و سەپان و کاسبکارانی کوردستانە، پرۆژەی ئەو بەشەی کۆمەڵگای کوردستانە کە خەون بە یەکسانی و دادپەروەرییەوە دەبینێت، یان لانی کەم وا هەست دەکات ئەگەری بینینی خەونێکی لەو بابەتە بەشێکە لەو مێژووەی تیایدا ئامادەیە و دەرگیریی تەحەدا و مژدە و بەڵێن و مەترسییەکانێتی.
ئەم خەونە لە شیعری قانعدا خەونێکە، بە پلەی یەکەم، دژ بە سەرجەمی ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکەی سیستمی دەربەگایەتییە، هەڵگری ڕەهەندێکی هیومانیستی گرنگە و خەونی یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی دژ بە پلە و پایە و جیاکاری و میکانیزمە زۆرەکانی هەڵاوێردن لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا ئاراستەی دەکات. سۆسیالیزم لەم ئەزموونەدا چەندە هێزەکانی لای خوارەوەی کۆمەڵگا دروستی دەکەن، بەهەمان ئەندازە زانست و ڕوانین و بیرکردنەوەی نوێ دروستی دەکەن و دەیپارێزن.

٥

ئەو تاکەکەسەی لە شیعری قانعدا دەتوانێت نەتەوە لە ژێرەوە دروست بکات و ئاکارێکی هیومانیستی و سۆسیالیستییانەی پێ ببەخشێت تاکەکەسێکی تەواو مۆدێرن و دونیاییە. واتە تاکەکەسێکی خوێندەوار و هاریکار و لەخۆ بردووە، پەیوەندیی بە دونیاوە پەیوەندییەکی بنەڕەتییە، بوونەوەرێکە تێکەڵ بە کێشە و گرفت و مژدە و ئەگەرکانی دونیا، دەستوپەنجە وزە تایبەتەکانی لەناو قوڕ و لیتە و دار و بەردی دروستکردنی مێژوودای تاکەکەسیی خۆی و مێژووی نەتەوەیی و نیشتیمانیدایە. ئەم تاکەکەسە ئەو شێوازەیە لە مرۆڤ لە هەر شوێنێکەوە دەربکەوێت لەناو ڕووبەرێکدایە کە لە دۆخی دروستکردن و تازەکردنەوە و سەرلەنوێ داڕشتنەوەدایە. کەسێکە ئینتیمای بۆ دونیا بەر لە هەموو ئینتیماکانی تریەتی، یان وردتر بدوێم ئینتیمای بۆ دونیای سەرزەمینی، هەموو ئینتیماکانی تریەتی، لەوانەش ئینتیمای نەتەوەیی و دینی.
ئەم بوونەوەرە دونیاییە لە شیعری قانعدا تێکەڵێکە لە ڕۆشنبیر و فیدایی، خوێندەوار و پێشمەرگە، دانا و چالاکەوانێکی پڕ وزە. زۆربەی جار گەنجێکە پڕ حەماسەت و خەون و توانای جێبەجێکردنی کردەی مێژوویی گرنگ. شوێنی ئیشکردنی سەرەکی ئەم تاکەکەسە تازەیە "ژیانی گشتی"ە، ئامادەبوونیەتی لەناو ئەو کێشانەدا کە ئەم ژیانە گشتییە دروست دەکات، بەرگریکردنیەتی لە مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ئەم ژیانە گشتییە. ئەم ژیانە گشتییە بەشێکە لە ئاکاریی ئەو و ئەویش بەشێکە لە مژدە و تەحەداکانی ئەو ژیانە گشتییە.
لە شیعری قانعدا ڕەگەزی ئەم تاکەکەسە گرنگ نییە، گرنگ نییە نێرە یان مێ، خەڵکی کام شوێن و سەر بە کام دین و مەزهەبە، گرنگ ئەوەیە هەم دروستکەری نەتەوە و نیشتیمانە و هەم دروستکەری خۆیەتی وەک بوونەوەرێکی مۆدێرنی خاوەن ئینتیمایەکی بەهێز بۆ پرۆژەی بونیادنانێکی سۆسیالیستییانەی نەتەوەیەکی سەروەر و پێشکەوتوو. گرنگ ئەوەیە هەم بەشێکە لە دونیا بە هەموو مژدە و ئەگەرەکانییەوە، هەم بەشێکە لە هەستکردن بە دۆخی کەوتن و نەهامەتی و هەڕەشەکانی ئەو دونیایە. لە شیعری قانعدا هەستێکی بەهێز بە هاودەردی، یەک چارەنووسی، هاریکاری، کاری پێکەوەیی، گیانفیدایی، دەبینرێ. برایەتی و ئازادی و یەکسانیی لە پاڵ یەکدا و



بەتەنیشت یەکەوە ئامادەن، ئەمانەش یەکانگیرن لەگەڵ ئەو ڕوانینەدا بۆ دونیایی-بوونی مرۆڤ، وەک بە بەشێکی چالاک لە ژیانێکی کۆیی و دەستەجەمعی هاوبەش.

ئەم تاکەکەسە لە شیعری قانعدا تاکەکەسێکی ئیشکەرە، ئیشکەرە هەم لە سەر خۆی و هەم لە سەر ئەو دونیایەی تیایدا دەژی. وەکچۆن دروستکردنی نەتەوە کارێکی دروستکەرانە و پێرفۆرماتیڤییە، بەهەمانشێوە دروستکردنی ئەو تاکەکەسە بۆ خودی خۆی دروستکەرانەیە. مرۆڤ لێرەدا شتێک نییە بە سروشتێکی نەگۆڕ و جێگیرەوە بۆ یەکجار و بۆ هەتاهەتایە دروستکرابێت، مرۆڤ هەم خۆی دەتوانێت خۆی وەک بوونەوەرێکی تازە دروستبکات و هەم دەتوانێت ئەو دونیایەشی کە تیایدا دەژی سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە و لە زۆر ئاست و ڕووەوە بگۆڕێت.

ئەوەی دیوانەکەی قانع بخوێنێتەوە و لەگەڵ ئەو شیعرانەدا بژی کە باس لە دروستکردنی ئەم دونیا نوێیە دەکات، هەستێکی گەورەش بە گەشبینیی دەدۆزێتەوە، گەشبینی تا ڕادەی گەشەکردنی بۆ جۆرێک لە ئیرادەگەرێتیی سەرسەختانە بەرامبەر بە دونیایەک کە برێکی زۆر مەیل و حەز و توانای نەگۆڕان و تازەنەبوونەوەی تێدایە. مرۆڤ لە شیعری قانعدا بوونەوەرێکی ئیشکەرە، ئیش دەستنیشانی شوناسەکەی دەکات، بەتایبەتی ئیشێک هەم خۆی لە ڕێگاوە دروست بکات و هەم ئەو دونیایەی تیایدا دەژی.




بەم مانایە شیعری قانع شیعری دروستکردنی دونیایە، دونیایەکی نوێ لە بەرامبەر دونیایەکی دروستکراو و باڵادەستدا. زمان لەم شیعرەدا ئەرکێکی دروستکەرانەی هەیە، ئەوەی بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن performative، زمان وەک چۆن قەسیدەیەک دروست دەکات، وەک چۆن وێنە و وەزن و ئیقاع و ڕستەکان لەناو شیعرێکدا دروست دەکات، ئاواش خشتێکی ئەو دونیا تازەیە دروست دەکات کە پێویستی بە بیناسازییەکی مێژوویی گەورە و بەردەوام هەیە، هەروەها بەشێکیش لە وزە ناوەکییەکانی ئەو بکەرە مێژووییەش دروست دەکات کە پێویستە ئەو دونیایە دروستبکات.

ئەگەر پرۆژەی دروستکردنی نەتەوە لای حاجی قادری کۆیی زیاتر لە پرۆژەی خۆپاراستن لە کۆمەڵێک هەڕەشە و مەترسیی گەورەوە ئاڵابێت: هەڕشەی چوونە دەرەوەی کورد لە مێژوو، هەڕەشەی گۆڕرانی کوردستان بە ئەرمنستان، هەڕەشەی دواکەوتنی کورد لە سەرجەمی مرۆڤایەتی بە هۆی نەبوونی "قەڵەم" و "کتێب"ەوە، هەڕەشە لە کورد بەوەی ببن بە قەرەجی ناو مێژوو، ئەوا لای قانع خەونێکی یۆتۆپی و کۆمەڵێک مژدەی گەورە و بردنەوەی دونیایەکی تەواو نوێ ئەم پرۆژەیە ئاراستە دەکات. بێگومان هەڕەشەکان لای قانعیش ئامادەن، بەڵام زەبر و جەبری ئەم هەڕەشانە بە بوونی پرۆژەیەکی مێژوویی لە جۆری دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی لە کوردستاندا لە ناوەوە سنووردارکراوە، یان لانیکەم تەریب بەو هەڕەشانە پرۆژەی بونیادنانی دونیایەکی لەو بابەتە پێشنیار و ئامادەکراوە.

ئەمە وا دەکات شیعری قانع هەم هەڵگری ڕەهەندێکی پۆزەتیڤ و گەشبین بێت، هەم ڕۆڵێکی قارەمانانە بە نەوە نوێکان ببەخشێت لە هێنانەدی ئەم خەونە یۆتۆپیە سۆسیالیستییەدا. قانع مێژووی ئێمە وەک مێژوویەکی وەستاو و گیرخواردو بەدەوری خاڵێک و کێشەیەکدا نابینێت، بەڵکو وەک مێژوویەکی پڕ جووڵە و گۆڕران و ژێرەوژوور بوونەوەی جیاواز وێنای دەکات. ئەم هەستە قووڵەیە بە جووڵە و گۆڕانی بەردەوام و چاوەڕواننەکراو وا دەکات قانع لە دیالۆگێکی بەردەوامدابێت لەگەڵ نەوە نوێکاندا، نەوە نوێکان بەردەوام لە مژدەکان و تەحەداکانی مێژووی



ئێمە ئاگاداریان بکاتەوە، لە هەوڵی پاراستنی ئەو وزە ناوەکییەدا بێت کە پێویستە بۆ گۆڕران، داوای وەفاداریان لێ بکات بۆ پرۆژەی دروستکردنی ئەو "ژیانە گشتی"یە کە بەشێکە لە خەونەکانی ئەو شاعیر و لە ئەگەرەکانی ناو مێژووی ئێمە وەک مێژوویەکی کۆنکرێت.

یەکێک لە شێوازە هەرە سەرەکییەکانی پیادەکردنی ئەم دیالۆگە لە نێوان قانع و نەوە نوێکاندا نووسینی "وەسیەت"ە. قانع یەکێکە لەو شاعیرە کەمانەی کورد کە ژمارەیەکی زۆر وەسێتی جیاوازیی بۆ نەوە نوێکانی دوای خۆی بەجێ هێشتووە و ناوەڕۆکی وەسێتەکانیش داکۆکیردنە لە پرۆژەی گۆڕانکاری و ڕێگرتنە لە پشتنەکردنە ئەو پرۆژە گەورەیەی گۆڕانکاری و پێشکەوتن کە قانع و بەشێک لە نەوە ڕۆشنبیرە هاوتەمەنەکانی، خەونیان پێوە دەبینی.

بە کورتی بیرکردنەوە لە نەتەوە لە شیعری قانعدا بیرکردنەوەیە لە وزەیەکی نوێ بۆ گۆڕانکاری، لە چوارچێوەیەکی تازە بۆ لەناو دونیا و مێژووبووندا و لە ئامرازێک بۆ پێشکەوتن. نەتەوە پێدراوێکی بایۆلۆژیی نەگۆڕ نییە، بەڵکو پرۆژەی بەخشینی وزەیەکی نوێیە بە مێژوو، کرادرێکی تازەیە لەناو مێژوویەکدا کە قۆناغی دووبارەبوونەوەی بەجێ هێشتووە، مێژوویەک کردار دروستی دەکات و کردار دەیگۆڕێت. نەتەوە لێرەدا بازدانێکە بەرەو پێشەوە، دەسکاریکردنێکی ڕادیکاڵی پێکهاتی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزیی کۆمەڵگایە، دروستکردنی سەرزەمینێکی نوێیە بۆ یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی زانستی، بۆ بوون بە بەشێک لە دونیایەکی زیندو و پێشکەوتوو.

نەتەوە لە ئەزموونی قانعدا لە یەک کاتدا هەم شوناسە، هەم ئەرکە، هەم کردەیە، هەم پەیوەندییە، نەتەوە بوونەوەرێکی نوێیی پڕ جووڵە و چالاکییە کە دەسکاری سەرجەمی شتەکان دەکات، دەسکاری ڕوانینەکان، دەسکاری وێناکردنی زەمەن، دەسکاری زمان و دەسکاریی چاوەڕوانییەکان.

له پێش هەموانیشەوە پرۆژەی دروستکردنی خودێکی مێژوویی نوێیە.

## ٦

"تەماهیکردن لەگەڵ نەتەوە"دا هەڵسوکەوتێکی شیعریی هاوبەشە لە نێوان ئەندامانی ئەو نەوە شیعرییەدا کە قانع یەکێکە لە ناوە دیارەکانی. تێگەیشتن لەم ڕاستییە ئەدەبی و فەرهەنگییە کۆڵەکەی سەرەکی تێگەیشتنە لە ئەزموونی ئەدەبیی ئەوە نەوەیە کە لە دوای حاجی قادری کۆییەوە تا بەرپابوونی شۆڕشی چەکداری کورد لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، ئامادەبوون و کاریان کردووە. ئەم کردەی تەماهیکردنە کردەی قبووڵکردنی دونیا نییە بەو شێوەیەی کە هەیە، بەڵکو کردەی دروستکردنی نەتەوەیە بە زیاد لە شێوەیەک و بە زیاد لە زمانێک و لە زیاد لە ئاستێکدا وەک بەشێک لە دروستکردنی دونیایەکی نوێ و پێشکەوتوو.

نەتەوە لە پەنجا ساڵی یەکەمی مێژووی سەدەی بیستەمی کۆمەڵگای ئێمەدا داهێنراوێکی تازەیە، مێژوویەکی درێژی بوون و ئامادەگیی نییە، هێزێکی تازەیە لە بەردەمی مێژووی ئێمەدا، بۆیە کردەی تەماهیکردنەکە خۆی هاوکات کردەی دروستکردنیشە، کردەی بەخشینی فۆرم و زمان و ڕەنگ و سەدا و وێنەیە بەو نەتەوەیە. ئەم دۆخە ئەدەبییە تایبەتە دەکرێ وەک "ئەزموونێکی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی دەستەجەمعیی" ناوبنێین، ئەزموونێک گەرچی بێ-ڕەگەز و پێکهاتەی تاکەکەسیی نییە، گەرچی شاعیرەکانی لە زۆر ئاست و ڕووبەردا لە یەکتری جیان، بەڵام سەرجەمی ئەزموونەکە ناکرێ کورت بکرێتەوە بۆ ئەزموونێکی تاکەکەسی.



ئەم ئەزموونە دەستەجەمعییەی دروستکردنی نەتەوە لە ئەدەبدا، تەنها پەیوەست نییە بە شێوازی بوون و ڕوانین و تاکبوونی ئەم یان ئەو شاعیر و نووسەری ئەو نەوەیەوە، بەڵکو پابەستە بە بوونی هەموویانەوە وەک نەوەیەک و ئەزموونەکەشیان بە پلەی ئەزموونێکی ئەدەبی و ڕەمزی و فەرهەنگیی دەستەجەمعییە. ئەم نەوە ئەدەبی و شیعری و ڕۆشنبیرییە زیاتر لە تیپێکی مۆسیقا دەچن کە هەموویان "یەک زەمەنی ناوەکی" ی هاوبەشیان هەیە، هەموویان یەک ئاوازی سەرەکیی لێ ئەدەن، کە ئاوازی دروستکردنی نەتەوەیە، بەڵام هەر یەکەیان لە سەر ئامێرێک و بە دەنگ و سەدا و خێراییەکی جیاوازەوە کارەکەی ئەنجام ئەدات. وەکچۆن مۆسیقارەکانی ناو تیپێکی مۆسیقا لە ڕێگای ئامێرەکانییانەوە بەیەکەوە پەیوەستن و ئەو زەمەنە دروست دەکەن کە زەمەنی ژەنینی مۆسیقاکەیە، ئەم نەوە ئەدەبییەی دوای حاجی قادریش، بەهەمان شێوە کاردەکەن و ئەوەی بەیەکەوە کۆیان دەکاتەوە شیعرە وەک پرۆژەی دروستکردنی نەتەوەیەکی مۆدێرن.

ئەمانە هەموویان هەستێکی ناوەکییان بە زەمەنە مێژووییە تایبەتەکەی خۆیان و بە گرنگیی ئەو زەمەنە هەیە، لەناو ئەو زەمەنە مێژووییە تایبەتەدا زەمەنێکی شیعری و ئەدەبیی دروست دەکەن کە هەم بە یەکتریانەوە گرێ ئەدات، هەم بە توندی دەیانبەستێتەوە بە کۆمەڵگا و خەون و کێشە و تەحەداکانی سەردەمەکەی خۆیانەوە. وەک وتم ئەم ئەزموونە دەستەجەمعییە لە حاجی قادری کۆییەوە دروست دەبێت، بەڵام لەگەڵ نەوەی قانعدا، بەتایبەتی لەگەڵ قانع خۆیدا، دەبێت بە ئەزموونێکی ئەدەبیی باڵادەست. بەشدارییکردن لەم ئەزموونە دەستەجەمعییە گشتییەدا وای کردووە شاعیرانی ئەم نەوەیە بە ڕادەیەکی زۆر لە یەک بچن و لە زۆر ڕووەوە ئەمیان تەواوکەری ئەوی تر و ئەویان بەردەوامی ئەمی تریان بێت.

## ٧

لای قانع، وەک پێتریش هێمامان پێکرد، هەستکردن بە شوناسی کوردبوون دەچێتە قۆناغێکی ترەوە و فۆرمی پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتیی سۆسیالیستی و هیومانیستی وەردەگرێت، بەڵام ئەم هەستکردنە تایبەتە بە شوناس هاوشانە بە دروستبوونی وێنەیەکی نوێ بۆ “ئەوی تر” لە شیعری قانعدا، وێنەیەک جیاواز لە وێنەی “ئەوی تر” لە ئەزموونی زۆرێک لە شاعیرانی تری سەردەم و ڕۆژگاری قانعدا.

لە شیعری قانعدا ئەم “ئەوی تر”ە بە پلەی یەکەم ئەورووپایە. ئەو بەشەی دونیا کە قانع کوردی وەک نەتەوە و کوردستانی وەک کۆمەڵگا پێ بەراورد دەکات ئەورووپایە. ئەورووپاش لە ئەزموونی قانعدا بەشە هەرە پێشکەوتوو و هەرە شارستانییەکەی جیهانە. شوێنێکە دەتوانێت وەک “پێوەرێکی شارستانیی” کار بکات، چونکە ئەزموونێکە دەتوانێت نیشانی بدات گەشەی ناوەکیی کۆمەڵگای کوردیی لە چ ئاستێکدایە و ئەگەرەکانی بەردەمیشی کامانەن.

ئەدەبیاتێکی گەورە لەسەر مەسەلەی چییەتی شوناس و چۆنیەتی بەرهەمهێنانی شوناس هەیە نیشانمان ئەدات کە بوونی “ئەوی تر”پێداویستییەکی سەرەکییە بۆ ناسینی خود خۆی، پێمان دەڵێت کە شوناس پەیوەندییە، “خود” هەمیشە پێویستی بەوەیە لە دەرەوەی خۆیدا “ئەوی تر”ێک هەبێت بتوانێت خۆی پێ بەراوردبکات و خاڵە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی خۆی پێ بپێوێت و ببینێت.

ئەم ڕاستییانە لە سەردەمی هیجڵەوە زانراون، هۆشیاریی مرۆڤ پێویستی بە”ئەوی تر”ە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەر لە هەمووشتێک لە خۆی بگات و لە دەرکەوتەکانی خۆی لەناو دونیادا تێبگات. مرۆڤ تەنها لە ڕێگای بەراوردەوە بە “ئەوی تر”، ناوەڕۆکی “من” و ناوەرۆکی “ئێمە”ی بۆ دەردەکەوێت و دەتوانێت ئەم دوو چەمکە لەوە ڕزگار بکات کە وەک دوو چەمکی بەتاڵ و بێناوەرۆک بمێننەوە.

“ئەوی تر” لێرەدا ڕۆڵی ئەو ئاوێنەیە دەبینێت کە “خود” پێویستی پێیەتی بۆئەوەی تیایدا لە خۆی ڕابمێنێت و دۆخی خۆی و دۆخی هۆشیاریی خۆی و شێوازەکانی دەرکەوتنی خۆی لەناو دونیادا بپێوێت و بناسێت. “ئەوی تر” لەم پەیوەندیەدا دەشێت فۆرمی “ئایدیال”ێک وەربگرێت کە بکرێ لە ڕێگایەوە دونیای ئەمڕۆی پێ بپێورێ و کێشە و گرفت و نووقسانییەکانی هەم پێ ئاشکرا بکرێت، هەم ببێت بە وزە و پاڵنەرێکی ناوەکیی بۆ نوێبوونەوە و داڕشتنەوەی دونیا و کۆمەڵگا.

ئەورووپا لە شیعری قانعدا ئەم “ئەوی تر”ەیە، ئەو “ئایدیال”ەیە کە بەبێ هیچ گرێیەکی کولتوری و بێ هیچ هەستکردنێک بە شڵەژانێکی ناوەکی، دەتوانێت هاریکاریی خود بێت بۆ ناسینیی خۆی. بەڵام لێرەشدا ئەزموونی قانع چەند هەنگاوێک لە ئەزموونی حاجی قادر دووردەکەوێتەوە و ئاڵۆزییەک بەخۆیەوە دەبینێت کە لە ئەزموونی حاجی قادردا بوونی نییە.

لە ئەزموونی حاجی قادری کۆییدا، ئەورووپا بۆ یەکەمجار لە ئەدەبیاتی ئێمەدا دەبێت بە “ئەوی تر”ێک کە دەکرێ مرۆڤ خۆی پێ بەراورد بکات، پێشکەوتن و دواکەوتن، خەون و پەژارە، مژدە و هەڕەشەکانی پێ بپێوێت. حاجی قادر لە زۆر شوێندا هێما بۆ ئەورووپا دەکات و وەک شارستانیەتیەکی بەهێز و پێشکەوتوو نمایشی دەکات. حاجی قادر هێما بۆ بورجی ئیڤڵ، بۆ تەلەگراف و شەمەندەفەر، بۆ زانست و چەک و تفاق و خوێندنی مۆدێرن لە ئەزموونی کۆمەڵگا ئەورووپییەکاندا دەکات. لای حاجی قادر ئەورووپا ئەو جێگەیەیە کە تیایدا دونیایەکی پێشکەوتوو دروست و بەهێز بووە و ئەم دونیایەش دەتوانێت ببێت بە ئاوێنەیەک ئێمە دواکەوتوویی خۆمانی تێدا ببینین.

لای حاجی قادر ئەورووپا ئەو هەلەی بە مرۆڤ



بەخشیوە دونیا بناسێت و موعجیزەکانی زانست تاقی بکاتەوە. ئەوروپا لای حاجی قادر دوو وەزیفەی سەرەکی دەبینێت، یەکەمیان هێما بۆ شێوازێکی تری ژیان و شارستانیەت دەکات کە لە پێش هەموو ئەوانی ترەوەیە. دووهەم ئامرازێکە بۆ ڕەخنەکردنی کورد بۆ خۆی بەتایبەتی بۆ ڕەخنەکردنی ئەو دیدە سوفیگەر و تێگەیشتنە خورافی و نێگەتیڤە کە لە دونیای ئێمەدا بۆ دین و زانست و پێشکەوتن بوونی هەیە.

حاجی قادر بە ئاشکرا لە ڕێگای هێماکردن بۆ تەکنۆلۆژیای مۆدێرنەوە ڕەخنە لە سۆفیزم دەگرێت و دەڵێت مرۆڤ چ سوودێک لە سەفەری سوفییانە بۆ ناو خودی خۆی دەکات، لە کاتێکدا مرۆڤ دەتوانێت سەیری تەلەگراف و شەمەندەفەر بکات و لەوە تێبگات چ ئەگەرێکی گەورەی سەفەرکردن بەناو دونیادا لە ئارادایە و چ توانایەکی گەورەی ناسینی دونیاش لە پشتی ئەم ئامێر و سەفەرانەوەیە.

ئەوروپا لە شیعریی قانعدا بەشێوەیەکی ئاڵۆزتر و هەمەلایەنتر لە ئارادایە بە بەراورد بە ئامادەگیی لە شیعریی حاجی قادری کۆییدا. لای قانعیش، وەک لای حاجی قادر، ئەوروپا ئەو جێگەیەیە کە دەبێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی تازە و بۆ ناسینێکی ڕاستەقینەی دونیا ڕووی تێ بکرێ. ئەوروپا لای قانع شوێنی پێشکەوتن و زانست و داهێنان و "کەشفی ئاسمان" و "قووڵایی دەریا" و دۆزینەوەی "زمانی باڵندە"کانە. بەڵام ئەوروپا لە شیعری قانعدا کورت نابێتەوە بۆ ئەم وێنە پۆزەتیڤ و شارستانییە گرنگە، بەڵکو هاوکات ڕوویەکی نوێ و ترسناکی دەبینرێ کە ڕووە کۆلۆنیاڵی و داگیرکارەکەیەتی.





ئەوروپا لای قانع وەک چۆن شوێنی عەقڵ و زانست و پێشکەوتنە، ئاواش هێزێکی "ئیستیعمار"ییە، "ئیستیعمار" بەهەموو ئەو مانا خراپ و نێگەتیڤانەوە کە لە ئەزموونی میللەتانی ئەم ناوچەیەدا هەیەتی. ئەم دابەشبوونەی ئەوروپا بۆ "ئەوروپای زانست" و "ئەوروپای ئیستیعمار" وێنەی ئەوروپا لە شیعری قانعدا ئاڵۆز دەکات و هێما بۆ لەدایکبوونی هۆشیارییەکی نوێ دەکات کە ئەم جیاکارییە ڕۆڵێکی گرنگی تێدا دەبینێت. بەڵام ئەمە هەموو شتەکان نییە، چونکە لای قانع لە پاڵ دابەشبوونی ئەوروپادا بۆ "ئەوروپای زانست" و "ئەوروپای ئیستیعمار"، هاوکات دابەشبوونێکی نوێی تر هەیە کە وێنەکە ئاڵۆزتر دەکات، ئەوەش دابەشبوونی ئەوروپایە بۆ "ئەوروپای کاپیتالیزم" و "ئەوروپای سۆسیالیزم".

ئەگەرچی شیعری قانع کەمتر لە سەر ئەوروپای کاپیتالیزم ڕادەوەستێت، بەڵام بەرگریکردن لە ئەوروپای سۆسیالیزم و پاڵپشتی بۆ سۆسیالیزم بەرگری و پاڵپشتیکردنێکی ئاشکرایە. لە چەندان شیعردا قانع ئەم مەسەلەیە بەئاشکرا باس دەکات و بە ئاشکرا دیدی خۆی لەم ڕووەوە بە خوێنەرەکانی دەناسێنێت.

بەکورتی لەناو شیعری قانعدا چوار وێنە بۆ ئەوروپا ئامادەیە، دوانیان پۆزەتیڤ و دوانیان نێگەتیڤ: ئەوروپای زانست و سۆسیالیزم بەرامبەر بە ئەوروپای ئیستیعمار و کاپیتالیزم. ئەم "ئەوی تر"ە تازەیە لە شیعری قانعدا لە یەک کاتدا دەبێتە هەڵگری کۆمەڵێک وێنەی جیاواز.

لەشیعری قانعدا ئاڵۆزبوونی ئەم وێنەی "ئەوی تر"ە هاوشان و تەریبە بە ئاڵۆزبوونی وێنەی "کوردبوون" خۆشی. شیعری قانع بەرگریکردن نییە لە کوردبوون لە هەموو دەرکەوت و شێوەکانیدا، بەڵکو بەرگریکردنە لە وێنەیەک لە وێنەکانی کوردبوون و دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی لەناو مێژوودا. لە ئەموونی قانعدا کوردبوون لەناو خۆیدا چەندان درز و کەلێن و چاڵی ڕەمزی و ماتریالیی تێدایە.

شیعری قانع بەرگریی نییە لە "کوردبوونی خێڵەکی" ی داخراو، یان لە "کوردبوونی

دینیی" لە مانا خورافییەکانیدا، یان کوردبوونێک کە دەرهاویشتەی عەقڵیەت و خەون و کردەی دەرەبەگانە و فیوادالییانە بێت، یان کوردبوونێک لە ئەنانیەتی کۆمەڵایەتی و پشتکردنە "قازانجی گشتیی"ەوە ئاڵابێت. کوردبوون لای قانع دەرکەوتی ئەخلاقی، دینی، کولتوری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی جیاوازیی هەیە و هەموو ئەو دەرکەوتانە قابیلی بەرگریلێکردن نییە.

کێشەی کورد لای قانع کێشەی شێوازە نەخۆش و بیمارەکانی کوردبوونە. بە مانایەکی دیکە وەکچۆن ئەوروپا لای قانع دابەش دەبێت بەسەر ئەوروپای "چەرچەل" و "لینینی"دا، ئەوروپای "کۆلۆنیالیزم" و ئەوروپای "سۆسیالیزم"دا، ئەوروپای پرنیسپەکانی ویلسۆن لە سەر مافی چارەنووس و ئەوروپای سایکس پیکۆ و فێڵکردن لە کورد لە ڕێکەوتننامەی لۆزاندا، ئەوروپای زانست و ئەوروپای درۆکردندا، بەهەمانشێوە شوناسی کوردبوون خۆشی لای قانع بەسەر چەندان شوناسی جیاواز و ناکۆکدا دابەش دەبێت. ئەو شوناسەی دەبێت بە بەشێک لە ئەزموونە شیعرییەکەی و هەندێک ڕەهەندی شوناسی شیعریی ئەو دەستنیشان دەکات، کوردبوون نییە بەمانا موتڵەق و ڕەهاکەی، بەڵکو کوردبوونە بەناوەرۆکێکی مێژووی و شارستانی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزیی تایبەتەوە.



لە شیعری قانعدا شێوازی جیاوازی کوردبوون دێتە کایەوە کە ڕووبەری چەپێنەر و چەوسێنەری جیاوازیان هەیە، کە هەڵگری بیماریی جیاوازن، پەیوەندیی جیاوازیان بە دونیاوە هەیە و تێگەیشتنی جیاوازیشیان هەڵگرتووە بۆ کۆمەڵگا و مرۆڤ و پێشکەوتن و دواکەوتن.

## ٨

شیعر لە ئەزموونی قانعدا تەنها ئامرازی سەرەکیی ناسینی دونیا، ناسینی "خودی کۆیی" یان دەستەجمعیی نییە، بەڵکو ئامرازی سەرەکی دروستکردنی ڕۆشنبیریشە بە مانا نوێکەی ڕۆشنبیر. ڕۆشنبیر کەمتر وەک ئامرازی ناسینی مرۆڤ و فیکریش کەمتر وەک هێزێک بۆ ناسینی تاکەکەس، بەڵکو هەردووکیان وەک بکەر و ئامرازی ناسینی دونیا، ناسینی کۆمەڵگا بە پلەی یەکەم. شیعر لای قانع و لای بەشێکی زۆری شاعیرانی سەدەی بیستی ئێمە، کەمتر ئامرازی ناسینی ئینسانە، کەمتر ئامرازی تەعبیرکردنە لە خود خۆی وەک تاکەکەس، کەمتر سەرقاڵە بە پرسیار و گومانە ناوەکییەکانی تاکەکەسەوە، بەڵکو زیاتر ئامرازی ناسینی دونیایە، ناسینی ئەو ژینگە هاوبەشەیە کە مرۆڤەکان بە یەکەوە دروستیان کردووە. شیعر کەمتر ڕووی لە نمایشکردن و دروستکردن و داهێنانی خودی تاکەکەسییە، زیاتر ڕووی لە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ئەو دونیا و کۆمەڵگایەیە کە تاکەکەسەکان تیایدا دەژین. بەڵام بە چ مانایەک قانع ڕۆشنبیرە؟ ڕۆشنبیر لە سەردەمی قانعدا چ مانایەکی لە دونیای ئێمەدا هەبووە؟

جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ حاجی قادری کۆیی وەک سەرەتای یەکەمی لەدایکبوونی ڕۆشنبیر لە دونیای ئێمەدا. ئەو پێوەرەشی بۆ پێناسەکردنی ڕۆشنبیر بەکاری دەهێنم هەڵگری دوو ڕەگەزە.



یەکەمیان ڕەگەزی ڕەخنەیی-بوون. دووهەمیان ڕەگەزی دونیایی-بوون. ڕەخنەیی بوون بەمانای دروستکردن و گەشەدان بە پەیوەندییەکی ڕەخنەیی بەو دونیایەوە کە ڕۆشنبیر تیایدا دەژی. دونیایی بوونیش بەمانای کردنی کێشەکانی ئەو دونیایەی تیایدا دەژی بە کێشەی بیرکردنەوە و شیکردنەوە و ڕاڤەکردن.

بەم مانایە یەکەمین کەسێک بکرێ لە مێژووی ڕۆشنبیریی ئێمەدا وەک ڕۆشنبیر پێناسی بکەین، حاجی قادری کۆییە. قانعیش وەک حاجی قادر هەردوو ڕەگەزەکەی کاری ڕۆشنبیر چ لە خۆیدا وەک تاکەکەس و چ لە نووسینەکانیدا ئامادەیە. وەک حاج قادری کۆیی قانعیش لە دیدێکی ڕەخنەیی هەمەلایەنەوە داوای دروستکردنی دونیایەکی نوێ دەکات لە جێی ئەو دونیا کۆن و تەقلیدییەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئامادەیە.

ئەوەی ورد قانع بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە ئەم شاعیرە خاوەنی پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی و دونیابینییەکی تازەیە سەبارەت بە مرۆڤ و کۆمەڵگا، دونیابینییەک دژ بە هەموو ئەو شتانەیە کە ڕێ لە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و تازەبوونەوەی عەقڵ و تازەبوونەوەی خەیاڵ دەگرێت. قانع نەک تەنها بوونەوەرێکی ڕەخنەگرە، بەڵکو شاعیرێکی مژدەبەخشیشە، ئەوەی بە ڕەخنە دەیڵێت بەشێکە لە کردەی ڕێخۆشکردن بۆ لەدایکبوونی دونیایەکی نوێ کە کردەی لەدایکبوونەکە خۆی وەک مژدەیەکی مێژوویی دەردەکەوێت. قانع لە یەککاتدا هەم خاوەنی کۆمەڵێک ڕای تازەیە لەسەر سەرجەمی بوارە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەم خاوەنی مەسەلەیەکیشە لە پێناویدا دەنووسێت. ئەوەی قانع دەکات بە ڕۆشنبیر ئەم ڕەگەزانەیە.





ڕۆشنبیر بەم مانایە بوونەوەرێکی نوێیە، ئاکاری سەرەکیی ڕۆشنبیربوونیشی ڕووبەڕوو بوونەوەیە لەگەڵ بۆچون و ڕا و ڕاڤەکردنە تەقلیدی و باڵادەستەکانی سەردەمەکەی خۆی. هەروەها پێشنیارکردنی کۆمەڵێک ڕا و بۆچوون و تێفکرینی نوێیە کە ئەو دونیایە یان نایانناسێت، یان دەشێت بیانناسێت و نەخوازێت قبووڵیان بکات. مەسەلەی ژمارەیەک لای ڕۆشنبیر، مەسەلەی دۆزینەوەی هەقیقەت یان بەرهەمهێنانی مەعریفە نییە، بەڵکو چوونە پەیوەندییەکی نوێیە لەگەڵ ئەو دونیایەدا کە تیایدا دەژی، پەیوەندییەک کە ڕەخنەگرتن و خەونی تازەبوونەوە و باشترکردنی ژیانی گشتیی ئەو دونیایە سێ ڕەگەزە هەرە گرنگەکەیەتی.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانەش شیعریی قانع وەرشەیەکی گەورەی ڕەخنەکردنی دەرکەوتە جیاوازەکانی دونیا دەکاتەوە. لەوانەش ڕەخنە لە دین و پیاوانی دین. ڕەخنە لە خورافاتی کۆمەڵایەتی و پرۆژەی گێلکردنی بەردەوامی کۆمەڵگا و بەرگریکردن لە عەقڵانیەت. ڕەخنە لە کۆمەڵگا خۆشی وەک یەکەیەکی دواکەوتوو، وەک سەرزەمینی پەیوەندی نایەکسانیی پڕ نایەکسانی و چەپاندن و بێ-مافکردن، ڕەخنە لە ئەخلاق وەک هێزێک بۆ بچوکبینینی مرۆڤ، بۆ بێ-ماف و قێزەونکردنی ڕەگەزی مێ، ڕەخنە لە سیاسەت وەک چالاکییەکی ئەنانی و بەرتەسک، ڕەخنە لە نەزانین و جەهالەت بە شێوەیەکی گشتی، ڕەخنە لە ڕەهەندە نێگەتیڤەکانی ژیانی مۆدێرن و بەهێزبوونی هەرچی زیاتری ڕۆحیەتی خودپەرستی و گەڕان بەدوای دەسکەوتی تایبەتدا لە سەر حیسابی کۆمەڵگا و ژیانی گشتی. لە ڕاستیدا شتێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی و دەستەجەمعیدا نامێنێتەوە لە شیعری قانعدا قابیلی ڕەخنەکردن نەبێت، ڕەخنە زمانی قسەکردنی ئەم شاعیرەیە لەگەڵ دونیا و کۆمەڵگادا.

## ٩

بێگومان ڕۆشنبیر هەمیشە بوونەوەرێکی تاکەکەسییە، کەسێکە خاوەنی ڕا و بۆچوون

و ڕوانینی تایبەتە، زۆرجاریش ڕوانین و دید و بۆچونێک کە کێشە و ناکۆکی لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا بۆدروست دەکات کە لە ناویدا دەژی. بوونی ڕا و بۆچوونی جیاواز لەوەی کە هەیە و بەتایبەتی باڵادەستە، مەرجی سەرەکی دروستبوونی ڕۆشنبیرە وەک بوونەوەرێکی نوێی ناو کۆمەڵگایەکی نوێ. بەرهەمهێنانی فیکر و نووسین و ئەدەبیات مرۆڤ بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ناکات بە ڕۆشنبیر گەر ئەو کەسە هەم ڕۆڵی ڕۆشنبیر نەبینێت، هەم ڕوانین و لێکدانەوەی تاکەکەسییانەی بەسەر شتەکانی تردا زاڵ نەبێت.

بەم مانایە ڕۆشنبیر هەم ڕا و بۆچوون و هەڵوێستی تایبەتی بەرامبەر بە مەسەلە گشتییەکان هەیە، هەم لە دیدی خۆیەوە لە سەرجەمی دیاردەکانی دونیای خۆی دەڕوانێت. لەم ڕووەشەوە قانع ڕۆشنبیرە بە مانا مۆدێرنەکەی ڕۆشنبیربوون. ژیانی شەخسیی قانع خۆشی شایەتی لە برێکی گەورە لە ویست و ئاکاری سەربەخۆی و ئازادیی شەخسی ئەدەن، کە خۆی بۆ خۆی دروستیکردون، نەک کۆمەڵگا یان ئەم یان ئەو هێزی کۆمەڵایەتی پێی بەخشیبن.

ئەو زەمینە کۆمەڵایەتییەی قانع لە ناویدا وەک ڕۆشنبیرێک دروست دەبێت، زەمینەی دروستبوونی نوخبەیەکی خوێندەوارە کە لە دونیای ئێمەدا ڕا و بۆچوونی تایبەتیان لەسەر ژیانی گشتیی کۆمەڵگاکەی خۆیان هەیە، کەسانێک ئەوەی بنەمای پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان دەستنیشان دەکات بە پلەی یەکەم خوێندەوارییە، نەک ئەوەی سەر بە خێزان و بنەماڵە و خێڵ و ناوچەیەکی دیاریکراو بن. لە سەدەی بیستەمدا خوێندەواریی لە دونیای ئێمەدا دەبێت بە سەرچاوەیەکی گرنگی بەدەستهێنانی سەرمایەیەکی ڕەمزیی گرنگ، بەتایبەتی لەگەڵ دروستبوونی سیستمی مۆدێرنی خوێندن و لەدایکبوونی دەزگای بیرۆکراتی مۆدێرن و لەگەڵ هاتنی میدیای مۆدێرندا، کە هەموویان پێویستیان بە کەسانی خوێندەوار هەبووە بۆئەوەی بتوانن وەک ڕووبەری تازە هەبن و کاربکەن.

ئەم زەمینە سۆسیۆلۆژییە تایبەتە ئەو زەمینەیەیە کە نەوەی قانع لە ناویدا دروست دەبێت و لە ناویدا ڕۆڵی خۆیان وەک ڕۆشنبیر دەبینن. ئەم نەوەیە یەکەمین نەوەی ڕۆشنبیریی ئێمەیە کە دەکەوێتە ناو وردەکارییە دەزگایی و فەرهەنگی و ڕەمزییەکانی دونیای مۆدێرنەوە. لەگەڵ ئەم ڕاستییانەدا ڕەهەندی تاکەکەسی و تاکەکەسبوون لە ئەزموونی ڕۆشنبیربوونی قانعدا ڕەهەندێکی هێجگار گرنگە. ئەگەر حاجی قادری کۆیی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لە پاڵ بنەماڵەی بەدرخانییەکاندا لە ئەستەمبوڵ ژیابێت و مامۆستای منداڵەکانی ئەو بنەماڵەیە بووبێت، ئەوا ئیشی قانع وەک ڕۆشنبیر لە دەرەوەی ئەو شێوازە لە ئیشکردن و ئینتیما و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتیدا بووە.

قانع مۆدێلی ئەو شێوازەیە لە ڕۆشنبیر کە تەنیا کەوتنی کۆمەڵایەتی خۆی، تاکەکەس-بوون و پەراوێزبوونی، هەژارکەوتنێکی ڕەها، دەخاتە سەرەوەی هەر جەبر و خواست و خەونێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، بەتایبەتی گەر ئەو جەبرانە لە ژێر ڕکێفی تاکەکەسی خۆیدا نەبووبن و خۆی بڕیاردەری ڕاستەقینە و ژمارەیەکی ناو ڕووداوەکانی ژیانی تایبەتیی خۆی نەبووبێت.

قانع وەک پیاوێکی ڕەخنەیی و خوێندەوار، بەلایەوە ئاسایتر و گونجاوتر بووە ئاشەوانی بکات، تا ئەوەی لە پاڵ ئەم یان ئەو هێزی کۆمەڵایەتیدا ژیانێکی کەمتر فەردی و کەمتر سەربەخۆی هەبێت. ئاشەوانیکردنی قانع، هێما نییە بۆ پاشخانی کۆمەڵایەتیی ئەم شاعیرە، دواجار قانع هەم شێخ بووە و هەم لە نەوەی بەگزادەکانی مەریوانیش بووە، ئەوەی وا دەکات ئەم پیاوە ئاشەوانی بکات بڕیاری سەربەخۆبوون و کردەی بەتاکەکەس-بوون و ئازادیی لە هەڵوێستدا ئاراستەی کردووە. ئەو شێوازە لە ژیان دەرەنجامی ناچارییەکی کۆمەڵایەتیی نەبووە، جەبرێکی ماددیی ئاراستەی نەکردووە، بەڵکو هەڵبژاردنێکی تاکەکەسی و ڕۆشنبیرانە بووە. لەم ڕووەوە ئینتیمای قانع



بۆ شیعر و ڕۆشنبیری، بۆ سەربەخۆبوونێکی بەردەوام، هاوکات ئینتیمایەکی بەهێز و دڵسۆزانەشە بۆ خود خۆشی، بۆ ئەو تاکەکەسە یاخییەی لەناو قانعدا وەک شاعیر و ڕۆشنبیرێک ژیاوە.

بەکورتی قانع تاکەکەسبوونی خۆی لەناو ئەو فەزا ڕەمزییە قورس و زەحمەتەدا ژیاوە کە شیعر و شاعیربوون، کە ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیربوون، کە ئینتیما بۆ تازەبوونەوە و ڕەخنەکردنی کۆمەڵایەتی و کە خەونبینین بە دروستکردنی کۆمەڵگا و فەرهەنگێکی نوێوە بۆی دروست کردووە. قانع لە ژیانی ئاسایی خۆیدا سەرجەمی ئەو شتانە ئەنجام ئەدات کە ئەم سەربەخۆبوون و تاکەکەسبوونە ڕەخنەیی و ئازادەی بۆ دەپارێزێت، لە ئاشەوانی-کردنەوە بۆ هەڵاتنی بەردەوام لە دەسەڵاتداران و لە مەلایەتی-نەکردنەوە بۆ کرێکاری و جوتیاریکردن.

## ١٠

قانع لە ئەدەبیاتی ئێمەدا هێما بۆ دروستبوونی شێوازێکی نوێ لە دەسەڵاتی ڕەمزیی دەکات کە دەسەڵاتی ڕۆشنبیرانە بە مانا مۆدێرنەکەی دەسەڵاتی ڕۆشنبیران، دەسەڵاتێک کە نە لەناو دینەوە دێت و نە لەناو بونیاد و پاشخانە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بەڵکو لەناو گوتارێکی ڕۆشنگەرانەوە دێت کە نوقسانییەکانی دونیای ئێستا و ڕووکارە پێشکەوتووەکانی دونیایەکی تر نیشان ئەدات. دەسەڵاتێکی ڕۆشنبیریی کە بە ناوی ئاسۆی نوێ بۆ گۆڕان و کارکردن بۆ تازەبوونەوە دەدوێت، بەڵام هاوکات زمانی ڕاڤەکردن و بەرجەستەکردنی ئەو ئاسۆ نوێیانەشی پێیە.



ڕەنگە لە مێژووی ڕۆشنبیریی ئێمەدا قانع یەکێک لەو نووسەرە هەرە گرنگانە بێت کە لە پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتی ڕۆشنبیری و دەسەڵاتی سیاسی و دینی و کۆمەڵایەتیدا، بە بەردەوامی بەناوی دەسەڵاتی ڕۆشنبیرەوە دوابێت و ئامادەش بووبێت تا ئەوپەڕی سنوورەکان لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا بڕوات. ئەمەش وای کردووە ئەم شاعیرە بەردەوام لە دۆخی کێشمەکێش و ناتەبابوون و ناکۆکییەکی بەردەوامدا بێت لەگەڵ ئەو هەر سێ شێوە سەرەکییەکەی دەسەڵات لە کۆمەڵگای ئێمەدا، مەبەستم دەسەڵاتی دینی و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی سیاسییە.

لەمەشدا دیسانەوە ئامادە بووە تا دواهەمین دەرەنجام لەگەڵ ناتەباییەکانیدا بڕوات. دواهەمین دەرکەوتی بەرگریکردنی سەرسەختانەی قانع لە دەسەڵاتی ڕۆشنبیران و ئاراستەکردنی ژیانی خۆی وەک خوێندەوارێکی سەربەخۆ، وەک پیاوێک خۆی مەرجەعی کۆمەڵایەتیی خۆی بێت و بۆ قسەکردن و نووسین و هەڵوێست وەرگرتن پێویستی بە ڕوخسەت وەرگرتن لە هیچ لایەنێک نەبێت، مردنی ئەم شاعیرەیە لە یەکێک لە گوندە هەرە چەپەک و داماوەکانی کوردستاندا و دوای مردنیشی بەجێهێشتنی تەنها شەش پەنجاییە وەک سەرمایەی تەمەنێک کە نزیکەی حەفتا ساڵ دەخایەنێت.

ئەمستردام
پاییزی ٢٠١٤

**سەرچاوە**

بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ژیانی قانع بڕوانە: دیوانی قانع. شاعیری چەوساوەکانی کوردستان. کۆکردنەوەی بورهان قانع. سنە، ١٣٨٥.

بۆ پێناسەکردنی نەتەوە وەک دیاردەیەکی سیاسی

بڕوانە:
Anderson, B.R. O'G (1983): Imagined communities. Reflections on the origin and spread of nationalism, Verso, London.
Gellner,Ernest(2009).Nations and Nationalism. Cornell University Press, New York.

بۆ عوسمانیزم بڕوانە:
S. Mardin 1962 The Genesis of Young Ottoman Thought. Princeton University Press

بۆ پان ئیسلامیزم بڕوانە: J.M. Landau, The Politics of Pan-Islam: Ideology and Organization (Oxford, 1994)

بۆ ناسیۆنالیزمی کولتوری بڕوانە:
Kanie, Mariwan (2010). Martelaarschap tussen natie en religie. Universiteit van Amsetrdam.
تێزەی دکتۆرای چاپنەکراو.

بۆ کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای "پۆزەتیڤیزم" و "داروینیزمی کۆمەڵایەتی" لەسەدەی نۆزدەهەمدا بڕوانە:
عزیز العظمة (٢٠١٢). العلمانية من منظور مختلف. الدين و الدنيا فی منظارالتاريخ. هەروەها بڕوانە نامەی دکتۆراکەی من بە زمانی هۆڵەندی کە لەسەرەوە هێمای پێکراوە. لێرەدا لەبەر کەمی ماوە مەودای قسەکردنی زیاتر لەسەر کاریگەریی ئەو دوو ئایدۆلۆژییایە لەسەر ئەزموونی حاجی قادرم نییە، بەڵام بەشێکی تێزی دکتۆراکەم لەسەر ئەم خاڵە وەستاوە. بەو هیوایەی لە ئایندەدا بە زمانی کوردی بیخەمە بەردەستی خوێنەران.

حاجی قادری کۆیی لەزۆر شیعردا باس لە گرنگی دروستکردنی دەوڵەت و نیشتیمانێکی سەربەخۆ دەکات، بڕوانە: حەمید سەردار میران و کەریم شارەزا (١٩٨٦). دیوانی حاجی قادری کۆیی. ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان. بەغداد. ل ٨٦، ٨٨، ١٧٨، ١٧٩، ٢٠٥، ٢٠٦، ٢٣٠، ٢٣١، ٢٦٠.

لە هەندێک خوێندنەوەدا تازەبوونەوەی شیعر و ئەدەبیاتی ئێمە دوادەکەوێت بۆ سەردەمی گۆران یان بۆ ئەزموونی عەبدولواحید نوری، بەڵام پێموایە ئەم ڕوانینە نا-ڕاستە و تازەبوونەوەی شیعر و ئەدەبیاتی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ساتەوەتی حاجی قادری کۆیی. لەگەڵ ئەم شاعیرەدا تێگەیشتنێکی تەواو تازە بۆ چییەتی شیعر و زمان و ئەرکی نووسین و ڕۆڵی شاعیر لە دونیای ئێمەدا دروست دەبێت. بەشێکی گرنگی شیعر و ئەدەبیاتی بەر لە گۆران و عەبدولواحید نوریش درێژکەرەوە و گەشەدانە بەو گۆڕانانەی لەگەڵ حاجی قادری کۆییدا دروست دەبن.

بۆ وردەکاری ئەم خاڵە بڕوانە: Mariwan Kanie (2010). Martelaarschap tussen natie en religie. politieke liefde, peozie en zelfopoffering in het Koerdisch nationalism. Universiteit van Amsetrdam. تێزی دکتۆرای چاپنەکراو.

لای قانع گۆڕانی ئەزمونە شیعرییەکەی بۆ ئەزمونێکی سیاسیی بە ناوەرۆکێکی سۆسیالیستییەوە مێژوویەکی تایبەتی هەیە کە باسکردن و ڕاڤەکردنی دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم نووسینەوە.

دەربارەی توانا دروستکەرەکانی زمان، یان زمان وەک هێزێکی دروستکەر، performative، بڕوانە:
Butler, Judith. "Performative Acts and Gender Constitution: An Essay in Phenomenology and Feminist Theory." Performing Feminisms: Feminist Critical Theory and Theatre. Ed. Sue-Ellen Case. Baltimore: Johns Hopkins UP, 1990.

بۆ خوێندنەوەی دیاردەی وەسێتکردن لە شیعری قانعدا بڕوانە: مەریوان وریا قانع سەردەمی ڕەخنە. ژمارە. 2006. شیعر و مەرگ، سەرنجێک لە وەسێتەکانی قانع. ل44-5 (٢٠١..).

Mary Jo Neitz and James Spickard. 'Steps towards a Sociology of Religious Experience. The Theories of Mihaly Csikszentmihalyi and Alfred Schutz', Sociological Analysis 1 (1990): 28.

بڕوانە: دیوانی حاجی قادری کۆیی. ل ٢٣٥.





# شوێن و ناسنامە لە ئاخرین ماڵی "قانع"ەوە تا ڕقی پیرۆزی "هێمن"



**ڕەخنەیەکی بەراوردکارانەی دوو دەقی شیعریی ئەدەبیاتی بەرخۆدانە**

**عەبدولخالق یەعقووبی**

**دەقی یەکەم : "قانع"**
**ئاخرین ماڵی...**

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەبچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە
بووکی ئازادیم ئەوێ خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێ
ئەڵقە ئەڵقەی پێوەنم وەک پڵپڵەو لەرزانەیە
گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابیخانەیە

**گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە**
**تۆپ و شەستیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە**
**بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ**
**قوڕ بە سەر ئەو دوژمنە هیوای بە بەندیخانەیە**
**گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم**
**نۆکەری و سەر دانەواندن کاری نامەردانەیە**
**چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکا**
**میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە**
**چەکی شۆڕشگێڕیی من نووسین و بیر و باوەڕە**
**ڕاپەڕینە هەڵمەتە پڕ نەعرەتەی کوردانەیە**
**"قانع"م ئەمرۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم**
**سەدهەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە...**
**.....بەندیخانەی تاران، ١٩٦٣**

## دەقی دووهەم؛ "هێمن"
## ڕقی پیرۆز

**دەمگرێ، ئەمما لە گرتووخانە ڕق ئەستوورترم**
**لێم دەدا، ئەمما لەسەر داوا ڕەواکەم سوورترم**
**دەمکوژێ، ئەمما بە گژ جەللادەکەمدا دێمەوە**
**کوردم و ناتوێمەوە، ناتوێمەوە، ناتوێمەوە**
**.....باشووری کوردستان، ١٩٧٤**

ئەدەبیاتی بەرخۆدان، ئەدەبیاتی هزر و تێڕامان نییە، بەڵکو ئەدەبیاتی دورشم و هەستیارییە. ئەدەبیاتێکە لەسەر بنەمای وروژاندنی سۆزی خوێنەر بۆ دەستەبەرکردنی هەڵوێستی مرۆڤانە و بەرزکردنەوەی ورەی خۆڕاگریی مرۆڤی ژێرەدەست و زوڵم لێکراوە. لەو سۆنگەیەوە بەشێکی بەرچاوی شیعری دوو شاعیری گرنگی سەدەی بیستەمی کورد، واتە قانیع و هێمن، لەسەر بنەمای چێکردنی ناسنامەی کورد لە دەلاقەی شۆڕش و خەبات و بەرگری و کۆڵنەدان و بەرەنگاری ساغ دەبێتەوە.

لەم کورتە وتارەدا هەوڵ دەدرێ باس لە هاوشێوەیی و جیاوازییەکانی نێوان دوو شیعری زۆر خوێندراوە و بەناوبانگی ئەو دوو شاعیرە بکەین و لەوە بکۆڵینەوە کە گوتاری بەرخۆدان لە واتا و ناوەڕۆکی ئەو دوو دەقەدا چۆن ڕەنگ دەداتەوە. بۆ ئەو مەبەستە لەسەر ئاستی پێکهاتە و ناوەڕۆکی شیعرەکان و بە پشتبەستن بە خوێندنەوەیەکی نیشانەناسانە و پێکهاتەخوازانە، ئەو دوو دەقە بەراورد دەکەین و لە جیهانبینی و واتاکانیان دەکۆڵینەوە.

شوێن (place) وەک پێناسەی ناسنامە (identity)



لە دەقێکی ئەدەبیدا، باسکردن لە شوێنێکی تایبەت، باسکردن لە ناسنامەیەکی تایبەتە. بۆ وێنە، ئەو مرۆڤەی کە لە ماڵ و وڵاتی خۆی دەژی، ناسنامەیەکی جیاوازی هەیە لەو مرۆڤەی کە دوور لە ماڵ و وڵاتەکەی ژیان بەسەر دەبات. تەنانەت لە ئاستی تاکە یەک مرۆڤیشدا، ئەو قسەیە ڕاستە. من ئەگەر هەنووکەش هەر لەو شارەی کە تێیدا لە دایکبووم بژیم، ناسنامەم جیاوازە لەو منەی کە دوور لەو شارە دەژیم کە تێیدا هاتوومەتە سەر دنیا؛ چونکی، بۆ نموونە، شێوەی وەبیر هێنانەوەی یاد و بیرەوەرییەکانم بە پێی ئەو دوو دۆخە جیاوازە دەگۆڕێ و ئەوەش دوو ناسنامەی جیاواز بە من دەبەخشێت. تەنانەت لە ئاستێکی لەباری جوگرافیی بەرتەسکتریشدا، ئەو قسەیە هەر ڕاستە. من ئەگەر لە شار و گەڕەکی شوێنی لە دایکبوونم بژیم، جیام لەو منەی کە هەر لە شار و شوێنی لە دایکبوونم دەژیم، بەڵام گەڕەکەکەم ئەو گەڕەکە نەبێت کە تێیدا لەدایک بووم.

بەندیخانە یان زیندان، وەک چۆن لە شیعرەکەی قانع-دا هاتووە، یان گرتووخانە، کە لە شیعری هێمن-دا ئاماژەی پێ کراوە، شوێنێکە کە مرۆڤی تێدا دەستبەسەر دەکرێ و تیایدا دەبێتە خاوەنی

ناسنامەیەکی تایبەت کە زۆر جیاوازە لەو مرۆڤەی لە دەرەوەی ئەو شوێنە دەژی. یەکەم تایبەتمەندیی ناسنامەی مرۆڤی نێوزیندان ئەوەیە کە ڕێگای پێ نادرێ لە هێزی ئیرادەی خۆی بۆ بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆی کەڵک وەربگرێت. مرۆڤی نێو گرتووخانە لە وەگەڕخستنی هێزی گۆڕینی ڕەوتی ڕووداوەکانی ژیانی خۆی، بەو شێوەیەی کە مرۆڤی دەرەوەی گرتووخانە لە دەستی دێت، بێبەری دەبێت.

کاکڵی ناوەڕۆک و واتای ئەو دوو شیعرەی قانع و هێمن ئەوەیە کە شوێنێکی وەک زیندان، بە پێی سروشتەکەی، دەشێت ناسنامەی مرۆڤێکی ئازاد و براوە، بۆ ناسنامەی مرۆڤێکی دیل و دۆڕاو بگۆڕێت، لە خواست و توانستی ئەوان بۆ ئەوەی بە سەربەستی و سەربەرزی بژین، بەڵام لانی کەم لە خەون و خولیایان کەم ناکاتەوە و نابێتە بەربەست لەسەر ڕێگای ئازادیخوازیی و شۆڕشگێڕییان.

قانع بەندیخانە بە "ئاخرین ماڵی ژیان" دەهێنێتە ئەژمار. واتە شوێنێکی خاوەن سروشتێکی توندوتیژ و دژ بە ئاسوودەیی دەروونیی لە چەشنی زیندان، وەک ماڵی ژیان، کە شوێنێکە تایبەت بە حەسانەوە و سەقامگیر بوونی دەروونی، لە قەڵەم دەدات.

هەر قانع دیسان بەندیخانە وەک قوتابخانە لەبەرچاو دەگرێت و کڕ و کپی و بێدەنگیی سەرکوتکەرانەی فەزای زیندان دەگۆڕێت بۆ زەنازەنا و مەیلی وەدەنگهاتنی قوتابخانە.





بە کورتی، قانع لە جیهانی شێعریی خۆیدا زیندان لە سروشتی خۆی دادەماڵێت و لەم ڕێگەیەوە ڕێگا نادات ناسنامەی خۆی ببێتە پێملی یاساکانی ئەو شوێنە. قانع دان بە دیلیی خۆیدا دەنێت لە زیندانەکەدا، بەڵام سنووری سروشتی زیندان دەبەزێنێت، بۆ نموونە، ئامادە نییە بێدەنگ بێت و واز لە خەونی ئازادیخوازانەی خۆی بهێنێت:

گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابیخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بە سەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەر دانەواندن کاری نامەردانەیە

"هێمن"یش هەمان هەڵسوکەوتی لەگەڵ گرتووخانە هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی حەماسیتر و شۆڕشگێڕانەتر. ئەگەر گرتووخانە بۆ دوژمنی "هێمن" شوێنێک بێت بۆ کوژاندنەوەی ڕقی شاعیر، (هەر چەند بۆمان هەیە لێرەدا بە گشتی باسی "دەنگی شیعری" بکەین نەک هەر شاعیر خۆی)، یا بۆ پاشگەز بوونەوە لە داوای ئازادیخوازانەی شاعیر و چۆکدادانی شاعیر لە هەمبەر جەللاد، یان توانەوە و تێداچوونی شاعیر لە هەمبەر دوژمن، ئەوە ئەو شوێنە دەبێتە مەکۆی ڕق ئەستوورتربوونی شاعیر، سوورتربوون لەسەر داوا ڕەواکەی، بەگژداهاتنەوەی جەللاد و نەتوانەوە و پەژیوان نەبوونەوە لە کوردایەتی.

"هێمن" وەک قانع باس لە گۆڕینی سروشتی زیندان ناکات و تەنانەت گرتن و لێدان و کوشتن کە دەرکەوتە و ئەنجامەکانی ژیانی نێو گرتووخانەن لە نێو دەقەکەیدا ئامادەن. ئەوەی هێمن پێداگریی لەسەر دەکات گۆڕینی ناسنامەی خۆی وەکو "گیراو" و "بەندی" و "دیل"ە بۆ مرۆڤێک کە بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی نەیارەکەیەوە، دواجار ناتوێتەوە و لەسەر ناسنامەی کوردبوونی مکوورە:

دەمگرێ، ئەمما لە گرتووخانە ڕق ئەستوورترم
لێم دەدا، ئەمما لەسەر داوا ڕەواکەم سوورترم
دەمکوژێ، ئەمما بە گژ جەللادەکەم دا دێمەوە

کوردم و ناتوێمەوە، ناتوێمەوە، ناتوێمەوە

بە وتەیەکی تر، جووڵەی ئەم شیعرەی هێمن، لە گۆڕینی شوێنەوە نییە بۆ بەهێزترکردنی باوەڕ، بەو شێوەیەی کە لە شیعرەکەی قانعدایە، بەڵکو لە بەهێزکردنی باوەڕەوەیە بۆ گۆڕینی شوێن. لە شیعری هێمندا، کوردی دیل لە گرتووخانەدا، ڕقئەستوورترە و لەسەر داوا ڕەواکەی، سوورتر دەبێت و لە بری تەسلیمبوون. بە گژ جەللادەکەیدا دێتەوە و بە پێچەوانەی ویستی نەیاری، ناتوێتەوە. هەر بۆیە ئەو بەهێزییە لە باوەڕی مرۆڤە کوردە یەخسیرەکەی نێو دەقی هێمندا، وا دەکات کە زیندان ئەو شوێنە نەبێت کە سروشتەکەی دەیخوازێت: گۆڕینی مرۆڤی دیل لەو شتەی کە خۆیەتی بۆ ئەو شتەی کە خاوەنی زیندان دەیخوازێت. لێرەدا زیندان وەک شوێنی چێکردنی ناسنامەیەکی نوێ بۆ مرۆڤی دیل، وەک چۆن لە شیعرەکەی قانعیشدا، توانایی گۆڕینی ناسنامەی هەنووکەی ئەو مرۆڤەی نابێت. هەر بۆیە نەیار و خێوی گرتووخانە، واتە دوژمن لە شیعری قانع و جەللاد لە شیعری هێمن-دا، ناتوانن بە دوا ئامانجی خۆیان بگەن.

لە هەر دووک دەقدا، دەنگە شیعرییەکان (SPEAKING VOICE)، کە خوێنەری ئاسایی زیاتر پێی خۆشە، ئەو دەنگە شیعرییانە، هەمان قانع و هێمن بن، ئاشکرا و دروشم-ئامێزانە پەیام و مەبەستی خۆیان دەگەیەنن. قانع پێداگریی پتری لەسەر دوو موتیفی "ئازادی" (کە لەم شیعرەدا ٥ جار بەکار هاتووە) و "بەندیخانە یان زیندانە" (کە ئەم دوو وشەیەش پێکەوە ٥ جار دووپات بوونەتەوە). ئازادی لەم دەقەدا هەم وەک بیروباوەڕ، هەمیش وەک کردە و کار، تەنانەت لە نێو بەندیخانەدا، نرخێنراوە:

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەبچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە
.
.
بووکی ئازادیم ئەویٙ خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێی
ئەڵقە ئەڵقەی پێوەنم وەک پلپڵەو لەرزانەیە
.
.
گەرچی دوژمن وا ئەزانیٙ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانیٙ کونجی زیندانم قوتابیخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە
.
.
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبیٙ
قۆڕ بە سەر ئەو دوژمنە هیوای بە بەندیخانەیە
.
.
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەر دانەواندن کاری نامەردانەیە
.
.
"قانع"م ئەمڕۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم
سەد هەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە...

کەچی هێمن پێداگریی پتری لەسەر چەمکی "کوردایەتی" و موتیفی "نەتوانەوە"یە (کە ٣ جار دووبارە بووەتەوە)، بەڵام بێگومان لە ناخی چەمکی نەتوانەوەدا واتای چەمکی "ئازادی"شدا بەدی دەکریٙ و دەلالەتێکی نەتوانەوە لەم شیعرەدا دەستبەردارنەبوونە لە مافی بەئازادی ژیان و مانەوە وەک کورد و بە ناسنامەی کوردی.
لە ڕوانگەی ئەم باسەوە، شیعری هێمن لە دوو سەرەوە لە شیعری قانع جیاوازە: یەکەم، قانع پێداگریی لەسەر شوێنە (واتە موتیفی بەندیخانە)، بەڵام هێمن جەخت لەو ڕووداوانە دەکات کە لەو شوێنە ڕوودەدەن (گرتن، لێدان، و کوشتن). دووهەم، دەنگی شیعریی دەقی قانع کەمتر دەرەتانی گشتگیربوونی تێدایە، بە تایبەت لە



سۆنگەی ناوهێنانی خۆی لە دوایین جووت دێڕدا:
"قانع"م ئەمڕۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم
سەد هەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەی

بەڵام هێمن لە بری ئاماژە کردن بە ناوی خۆی، وەک هێمنی شاعیر، لە ناوی کورد کەڵک وەردەگرێت و بەم جۆرە حاڵەتێکی گشتگیرتر و تەئویل هەڵگرتر بە دەنگی شیعریی خۆی دەبەخشێت:

دەمکوژێ، ئەمما بە گڕ جەللادەکەم دا دێمەوە
کوردم و ناتوێمەوە، ناتوێمەوە، ناتوێمەوە

ئەنجام

قانع پەیوەندییەکی ڕاستەخۆ لە نێوان شوێنی ژیانی هەنووکەی، کە بەندیخانەیە، لەگەڵ ناسنامەی خۆی، کە ئازادیخوازییە، دەهێنیتە ئاراوە.

بەڵام هێمن ئەو پەیوەندییە وەک پەیوەندییەکی ناراستەوخۆ دەبینێت و بۆ دەستەبەر کردنی ناسنامەی کورد بوونی، پتر پێداگری لەسەر چۆنێتیی هەڵسوکەوتی زیندانی دەکات لە نێو بەندیخانەدا تا وێنا کردنی بەندیخانە وەک "ئاخرین ماڵی ژیان".

ناوی شیعرەکەی هێمن خۆی ئەم ڕاستییە ئاشکرا دەکات: چۆن چۆنی بەندی لە نێو گرتووخانە "رقێکی پیرۆز" لە خۆیدا دژ بە ناحەزی خۆی چێ بکات.

بەڵام ئەوەی دواجار ئەو دوو شیعرە لە ژێر ساباتی یەک پێناسەدا کۆ دەکاتەوە ئەوەیە کە شوێنێکی لە چەشنی بەندیخانە – گرتووخانە، کە زەوتکەری ئازادیی مرۆڤ – کوردە، ناتوانێت ناسنامەی ئەو مرۆڤ – کوردە بەندکراوە بگۆڕێت کە تا سەر ئێسک باوەڕی بە ئامانجی ئازادیخوازی – کوردایەتی هەیە.

**هەولێر/ هاوینی ٢٠١٤**





# جیاوازی وێنەی شیعری لای قانع و لای گۆران

**ئەردەڵان عەبدوڵڵا**



دیارە قسەکردن لەسەر دوو شاعیر، هەروا کارێکی ئاسان نییە. کارەکە ئاڵۆزترو زەحمەتتر دەبێت، کاتێک ئەم دوو شاعیرەش، لە شیعردا لوتکە بن و بەدوو کۆڵەکەی شیعری کوردی دابنرێن. قانیع و گۆران دوو شاعیری مەزن و پایەبەرزی کوردن. قسەکردن و شرۆڤەکردن لەسەر شیعرەکانیان هەروا ئاسان نییە. ئەم دوو شاعیرە هەردووکیان لەیەک کات و شوێندا ژیاون. لە ڕووی فکری و سیاسیشەوە زۆر لەیەکەوە نزیک بوون. بەڵام لەهەمان کاتیشدا دوو دیدی جیاواز، دوو بۆچوونی دوور لە یەکتری، بۆ ژیان و جیهانیان هەبووە. وێنەی شیعری لای شاعیر باشترین کەرەستەی شاعیرە.

هەربۆیە ئێمە تەنها لەڕێگای وێنە شیعرەکانیانەوە دەتوانین ئەم جیاوازیەمان بۆ دەربکەوێت. من لێرەدا هەوڵ دەدەم چەند پەیڤێک دەربارەی ئەم جیاوازیە دەربخەم .

بۆیەکەمجار کە ئەم جیاوازیەم بۆ دەرکەوت، لەو شیعرانەدا بوو کە هەردوو شاعیر دەربارەی ناوچەی هەورامان نووسیویانە. دیارە ناوچەی هەورامان بەهۆی سروشتی جوانی، دیرۆکی کۆنی، لەچاو ناوچەکانی تر جێگای سەرنجی هەردوو شاعیری مەزن بووە. گۆران لە گەشتەکەیدا، بە جوانترین شێوەی شیعری، وەسفی هەورامان دەکات. هەروەک خۆشی دەڵێت، ئەم شیعرەی لەپاش چەند گەشتێک بۆ ئەم ناوچەیە نووسیوە، واتە تەنها یەک جار ئەم ناوچەیەی نەدیوە .

گۆران دەڵێت:

**کۆمەڵە شاخێک سەخت وگەردن گەش ،**
**ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش،**
**بۆ میوان ببێ مایەی تەسەلا**
**لەکۆڕی شەوا : مەلایە و مەلا**
**تۆ و مەلاو شیعرو فەلسەفەی ئیسلام**
**گوێ ڕاگرتنی تاوتاوی عەوام**
**ژنی هەورامان : سەرتاپای خشڵ،**
**سەرچاوەی بۆنی مێخەک و سمڵ**
**تابڵێی تەڕپۆش، ئاڵ و واڵا جل،**
**بەژن وبالا جوان، بەدەن نەرم و شل**



گۆران لەم شیعرەیدا بە کامێرای شیعری خۆی توانیویەتی جوانترین وەسفی هەورامان بکات. گۆران لەم گەشتەیدا تەنها وێنە جوانەکانی بینیوە. لە سروشت، لە مزگەوت، لە ژنی جوان. گۆران تەنها وەکو جوانپەرستێک هاتووە باسی هەورامان دەکات. بە دڵنیاییەوە ئەم شیعرەی گۆران، یەکێکە لە شیعرە جوان و بەرزەکان. لەو باوەڕەشدام کە تەنانەت شاعیرانی هەورامانیش، نەیانتوانیوە ئاوا بەجوانی وەسفی هەورامان بکەن.

بەڵام بابزانین قانع چۆن شیعرێکی نووسیوەو کامێرای شیعری ئەو، چۆن وەسفی ناوچەکە دەکات؛

**قەڵای هۆزو گەل، شاخی هەورامان**
**پرسیارم هەیە دەستم بەدامان**
**لەلام ڕووناکە، شاخێکی سەختی**
**پشت و کۆمەکی، وەخت و بێ وەختی**
**کتێبی زەردەشت، کە ئاویستایە**
**وەک باقی کتێب خەڵاتی خوایە**
**بەزمان هەورامی هاتە سەر بەشەر**
**یانێ های زەردەشت بووی بە پێغەمبەر**
**شاخی هەورامان وتی:**
**ئەی قانع لە من بێکەستر**
**لەمن داماوتر، لەمن بێدەستتر**
**مامۆستام نییە، بەلاو بخوێنێ**
**ئەولادەکانم بۆ تێگەیەنێ**
**جێی کشتوکاڵم تابڵێی کەمە**
**بەڵام پرچ و ڕیش تابڵێی هەمە**
**مەکتەبێک نەبوو! ئەمانە لابات**
**زانینی ڕاستی تێدا پەیداکات.**

لێرەدا شاعیر وێنەیەکی تر پیشانی خوێنەر دەدات، ڕاستە سروشتی جوان و مێژوویەکی کۆن، جێگای شانازییە، بەڵام لەهەمانکاتیشدا وێنەیەکی ترمان پێ نیشان دەدات، کەلای گۆران بوونی نییە. قانع تەنها شاعیرێکی جوانپەرست نەبووە، بەڵکە ڕەخنەگرێک و زانایەکی گەورەی کۆمەڵناسی-ش بووە. قانع تەنها دیوی دەرەوەی شتەکان نابینێت، بەڵکە هەوڵ دەدات کە مەلی هزری خۆی بۆناو قووڵایی شتەکان بفرێت. ئەو تەنها سروشتی جوانی هەورامانی نەدیوە، بەڵکە باسی کێشەکانی هەورامانیش دەکات. لەم دوو وێنە شیعریەشدا بۆمان دەردەکەوێت گۆران

جوانپەرستێکی بەتواناییە، بەڵام قانع جگە لەوەی جوانپەرستێکی بەتواناییە، شاعیرێکی ئێجگار قووڵ و ڕەخنەگرێکی بەتواناشە. گۆران لە شیعرەکەیدا، وەسفێکی جوانی مزگەوت و مەلاکان دەکات، بەڵام قانع وێنەیەکی تری کێشاوە، کە تەواو پێچەوانەی وێنەکەی گۆرانە

ژن؛

ژن پانتاییەکی بەرینی لە ناو شیعری کوردیدا داگیرکردووە. بەهەمان شێوەش لای ئەم دوو شاعیرە گەورەیەشمان، ژن پانتاییەکی بەرینی لەناو شیعرەکانیاندا داگیرکردووە. هەردوو شاعیر، ژن ئیلهامێکی گەورەی شیعرەکانیان بووە. ووزەیەکی گەورەی ناخیان بووە، باشترین پاڵنەربووە، بۆ بارانی سەوزی شیعریان. لێ دیسانەوە دوو وێنەی تەواو جیاواز لای قانع و گۆران بەدی دەکەین. گۆران دیسانەوە بە شەقامەکانی جوانیدا پیاسە دەکات و کامێرای شیعری خۆی، بەشێوەیەکی جدییانە دەخاتە سەر دیمەنی دەرەوەی ژن. کاتێک شیعرەکانی گۆران بخوێنیتەوە هەست دەکەیت چەندە لە داڕشتن و ڕازاندنەوەی شیعرەکانیدا، زۆر وەستایانە وەسفی جوانی لاشەی ژنی کردووە. گۆران یەکێکە لەو شاعیرە مەزنانەی کە لە وەسفی جوانیی ژن دا، مامۆستایەکی ئێجگار گەورەیە.

جوانی بێ ناو

**قژ کاڵی، لێو ئاڵی، پرشنگی نیگا کاڵ،**
**ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێک ئاڵ**
**ئەی ئەندام وردیلەی، نەرمۆڵەی، ئێسک سووک،**
**ئەی بەرگی ساکارت دڵگیرتر لە هی بووک**

بۆ کچێکی بێگانە:

**شان و مل و گەردنی ڕووتی بێ گەرد،**
**سنگی نەرم و، مەمکی قووتی توند وەک بەرد**
**بەژن و باڵای کەڵەگەت و شۆخ و شەنگ،**
**لەش و لاری کەمێک گۆشتن، کەمەر تەنگ**

بەڵام وێنەی ژن لە لای قانع شێوەیەکی تری هەیە. لە شیعرەکانی قانع هیچ کاتێک جەستەی نەرم و نۆڵ، مەمکی قووت، کەمەر و دەم و لێوی جوان نابینیت. بەڵکە لێرەدا شتێکی تر دەبینیت، کە تەواو پێچەوانەی ئەو وێنانەیە کە گۆران بۆ ژنی کێشاوە.

**سکاڵای نەسرین لای قانع**
**عاجز و مەلوول، دایم خەمبارین**
**هەتا مناڵین زەلیل و خوارین**
**گا، زەجرو لێدان، گا بە ڕووت و قووت**
**چڵکن و پلکن وێنەی مەلکەمووت**
**گەر بڵێم ئەمشەو ئەچمە سینەما**
**ئەڵێن تۆ کچی حەیات بۆ نەما**
**ئەوەڵ تا ئاخر، ئێمە هەر دیلین**
**ژیان سووتاو و زارو زەلیلین**

**ژیانی کچ**
**کەلە دایک بوو ئاهەنگی نییە**
**ئەڵێن ئای کچە ! فائیدەی چیە؟**
**سەدساڵ نەخۆش بێ، نابینێ دەرمان**
**لەجێی دڵخۆشی، هەرچەپۆک لێدان**

قانع لەم شیعرانەیدا هەوڵی داوە باسی "ژیان و گوزەران"ی ژن و کچی کوردمان بۆ بکات. دیمەنی جەستە و لەش جوانی لای ئەو گرنگ نەبووە. بەڵکە ئەو وەکو ڕەخنەگرێکی بەتوانا، کۆمەڵناسێکی شارەزا، خەمخۆرێکی پرسی ژنان، کەسێکی شۆڕشگێڕ و پێشکەوتخوازێک، وەسفی ژن و کچی کردووە. قانع لە ڕێگای شیعرەکانیەوە هاتووە، لەلایەک باسی ژیانی خراپی ژنان دەکات، لە لایەکی تریشەوە بەزمانی شیعری بەهێزی، ڕەخنەی توند ئاڕاستەی کۆمەڵگا دەکات.

بە بڕوای من هەتاوەکو ئەمڕۆش، هیچ شاعیرێکی کورد، وەکو قانع نەیتوانیوە بەجوانی وەسفی ژیان وگوزەرانی ژنان بکات. هیچ توێژەوەرێک، فێمینستێک ،هێندەی ئەو ڕەخنەی توندی ئاراستەی کۆمەڵگا نەکردووە. قانع وێنەیکی ژنمان پێ نیشان



دەدات، وێنەی کەسێکی قوربانی، بەش خوراو، چەوساوە. بەڵام بەداخەوە ئەم وێنانە لای گۆران و شاعیرانی سەردەمی خۆی نابینین

دەرئەنجام

بەدڵنیاییەوە چ گۆران چ قانع، هەردووکیان مامۆستای مەزن و شاعیری گەورەی گەلەکەمانن، هەردووکیان جێ پەنچەی خۆیان بەسەر شیعرو ئەدەبی کوردیدا هەیە. گۆران لە وەسف و جوانپەرستیدا، مامۆستایەکی بێ وێنەو شاعیرێکی مەزن بووە. بەڵام قانع جگە لەوەی لە هونەری وەسف و جوانناسیدا، دەستێکی باڵای هەبووە، لە بواری ڕەخنەگرتن و بینینی دیوەی ناوەوەی شتەکانیشدا، زۆر مامۆستایەکی گەورە بووە. قانع تەنها شاعیر نەبووە، بەڵکە ڕەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەنانەت ڕەخنەی دژی ئایینیش هەبووە. قانع بە چەکی شیعری خۆی، ڕەخنەی لەهەموو دیاردەیەکی نابەجێ و ناشرینی کۆمەڵگای کوردی گرتووە. لای قانع شیعر تەنها بۆ نووسین و خوێندنەوە نەبووە، بەڵکە شیعر پەیامێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی گرنگیشی هەبووە.

سەرچاوە

دیوانی گۆران. محەمەدی مەلا کریم. کۆی کردوەتەوەو ئامادەی کردوە. چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق. بەغداد، 1980

دیوانی قانع. کۆکردنەوەی بورهان قانع. چاپی چوارەم. سلێمانی. 2001





# قانع ڕەخنەگرێکی وشیاری سەردەم



**جەلیل ئازادیخواز**

ناسینی سەردەم و فامکردنی کۆی ئەو میکانیزمانەی کە دەبنە هەوێنی گۆڕانکاری و کە ئاڕاستەی دیاردەکان دیاری دەکەن و ڕەنگە لە کۆی ڕواڵەتبەندیی قۆناغێکی دیاریکراودا فاکتەر بن. بۆچی تایبەتی بەخشین بەم قۆناغە و لە فاکتەر جیانەکراوەکانی تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغەبن؟ بۆچی شاعیر و خوێندەوارێکی حوجرە کە لە دوو ئاڕاستەی جوانیناسی و دین باوەڕیدا دەتوانێ خاوەنی هەڵوێست و لێکدانەوە و بۆچوون بێت، زۆر گرنگ نەیەنە بەرچاو؟ هێندە کە لە ڕەهەندی توانایەکانی خۆیاندا پسپۆڕی یا شارەزاییەکی شیاویان هەبێت بەسە؟

شاعیر لە زمانەوە، لە ڕێگای خولقان لە زماندا، کۆی پێکهاتەی ڕێکخراوەکانی ژیانی ئاسایی هەم لە پەیوەندیە زمانییەکاندا و هەم لە جیهانی خەیاڵ و جوانیناسیدا هەڵدەوەشێنێت و بە لێکدانەوە و فام و جیهانی خەیاڵی خۆی و کۆی ئاوەزو فامکردنەکانی، هەموو ئەوانە جارێکی دی دادەڕێژێتەوە. واتە شاعیر هەم هاوشاری ئەم جیهانەیە، هەم وێرانکەرێکی بێ پسانەوە و بەردەوامی ئەم شارەیە کە خۆی هەنووکە هاوشاریەتی و هەنووکەش لە خولیای هەڵوەشاندنیایە.

کۆی ئەم پرۆسەیە، دەخوازێ کە شاعیر لە کۆی باوەڕو کلتوور و نەریت و پێکهاتەی کۆمەڵگاکەی خۆیدا، لێزان و شارەزایەکی هێندە شیاو بێت کە ڕۆلی ڕووخێنەرێکی خولقێنەر ببینێت.

هیچ گەورە شاعیرێکی کورد و جیهانی نییە کە ئەم پرۆسە و هەناوی خولقینەر و کۆی ئەو میکانیزمانەی کە دینامیکیت دەبەخشنە ئەم دیاردەیە، فام نەکردبێت و توانییتی ببێتە گەورەشاعیر، یاشاعیرێکی شیاو. ئەگەر شاعیر ئەم ڕەوتە و میژووی خولقان و هۆکاری گۆرانکارییەکان فام نەکات، ناتوانێت ڕۆڵی ڕەخنەگرێکی بەتوانا ببینێت کە جێپەنجەی بە دیاردەکانی کلتوور و جوانی و سیمای مرۆڤەوە دیاربیت. وەکچۆن بە مانایەک، هیچ شاعیرێک نییە کە ڕەخنەگر نەبێت لانی کەم ڕەخنە لە پێکهاتەی جوانیناسانەی هەنووکەو شوێنی مرۆڤ و بەختەوەری و دادوەریی و سروشت و ئازادی لە کۆی ئەم پێکهاتەیەدا و گوتاری زاڵی ناو هەناوی ئەم ڕایەڵە کۆمەڵایەتیەیە.

لەم کورتەباسەدا ڕامان لە هونەری شاعیرانەی قانع و ئەو دنیا جوانەی کە لە هەناوی زمان و لە یەک واتەدا لە بوونی مرۆڤی کورددا خولقاندویتی مەبەست نییە. مەبەست ئەوەیە کە قانع لە سیمای شاعیرێکدا و وەک لێزانێکی ئاینی چەندە توانیویەتی وەک ڕەخنەگرێکی کارا لە ئاست سەردەمەکەی خۆی دەرکەوێت؟

بۆ خولقانی ئەو جیهانە جوانەی کە بەها گەورە و بەرزەکانی سەربەستی، دادوەری و بەختەوەریی مرۆڤ لە ڕەگەزە سەرەکی و بنەڕەتیەکانێتی و لە دەورانی قانعدا کە دەورانی مۆدێرنەو مرۆڤی هەڵتەکاو وێرانکراوی دوای دوو شەری گەورەی جیهانی خۆی و ژینگەو کۆی حورمەتەکانی وێران و هەڵتەکاو کردوە، چەندە توانیویەتی لە ڕێگای شۆڕشی زمانەوە سەرکەوتوو بێت.



قانع وەک ڕەخنەگرێکی وشیاری سەردەمی خۆی، بە فامکردنی ئەم واقعە، کاری ئەو، تەنیا پێداهەڵدان و وەسف نییە. توانیویەتی ڕەخنەگرێکی وشیاری سەردەمەکەی خۆی بێت، ئەگەر بە یەکێک لە ماناکان پێمان وابێت کە ڕەخنە هەڵگری کۆئەرکێکی وشیارکەرەوەیە و ئەرکە سەرەکیەکانی خوێندنەوەی واقعی کۆمەڵگای خۆیەتی، پێویستە بڵێین:

سەرەکیترین ئەرکی ڕەخنە، هێنانە بەر باسی هەموو پیرۆزییەکان و دابەزاندنیانە بۆ بەردەستبوونی خوێندنەوە و لێکدانەوە و دەربازکردنیانە لە وەستان لە سەروو ئەقڵ و ڕەخنەوە. دەکرێ بڵێین ئامرازی ڕەخنە، وەستانێکی ئاوەزمەندانە و هۆشیارانەی ئەقڵە لەسەر هەموو دیاردەکانی بوون و ژیان، هەروەها هەموو ئەو چەمکانەی کە بەها گشتی و نرخە مێژوویی و کلتوورییەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان، بە دەوریاندا خەرمانەیان داوەو لەسەر و ڕەخنەو ڕامانی هۆشیارانەی ئەقڵەوە ڕایان گرتوون.

لە سەردەمی قانع و لەم قۆناغەشدا کە ئێمە تێیدا دەژین، ئاین و پیاوانی ئاین یەک لەو بەهایانەیە کە لە کۆی ئەم فراماسوینەی ژیانماندا دەیانەوێت خۆیان لە سەرووی ئەقڵ و لێکدانەوەی وشیاری هزرو ئاوەزەوە ڕاگرن و لەسەر بنەمای نەریتی بێ پرسیار درێژە بە پیروزیی بێ پرسیار و بێ ئەملاو ئەولای خۆیان بدەن. بەڵام قانع وەک ڕەخنەگرێک کە دەخوازێت کۆمەڵگا لە گەڕانەوەیدا بۆ دووبارە ناسین و خوێندنەوەی خۆی پێوەری ئەقڵ بێت و ئەم ئەقڵە لە چەقیدا مرۆڤ بە ڕەهایی ئازادییەکانی خۆی بەکاربهێنێ، ئەوەتە بەرگرەکانی گەشەو بووژانەوەی ئاوەز و کۆمەڵ، لەم بە پیروزکردن و لە سەرو ئەقڵ و ڕەخنەوە ڕاگرتنانە دەبینێ و دەهێنێتە بەردەم ڕەخنەو دەڵێت :

چوار شتن ئەمرۆ کە بوونە نەگبەتی کوردی هەژار
جەهل یەک، بێعەقلی دوو، دڵپیسی سێ، داوا چوار
مەنعی پێشکەوتن ئەکەن لەم خاکمانە چوار گرۆ
خان یەک، سەردار دوو، بەگزادە سێ، ئاغا چوار
نایەڵن بۆ خۆم ڕەحەت بم، سەربەخۆ تاوێ بژیم

ئەجنەبی یەک ، مامە دوو ، ئەقتاعی سێ ، کوێخا چوار
من لە داخی سەرکزیی ئەم میللەتە، چوار دەردمە
سیل یەک، مالاری دوو ، چاو کوێری سێ ، ئیسقا چوار
باز بووم باڵی شکانم چوار بەڵای نەحسی خراپ
خانەقا یەک، تەکیە دوو، عەمامە سێ، ئاغا چوار

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ڕەخنە پرسیارە لە هەموو بوونەکان، کە دەکرێ وانە بن، یا بوونیان بە جۆرێک لە جۆرەکانی تر گونجاوترە. کەوابوو دەتوانین بڵێین ڕەخنە دەرچوونە نەک تەنیا لە دۆخی ئیستا، بەڵکو دەرچوونە لە دۆخێک کە ڕەنگە جێکەوتوویی مێژوویی یا کلتووری یا.... هتد یان هەیە .
کلتووری پێش مودیرن و هەموو نەریتە ئازادی کوژەکانی ژن بەکۆیلەکەر، لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، یەک لەو گرفتانەیە کە قانع زۆر بە وشیاریەوە مامەڵەیان لەگەل دەکات، خوازیاری دەرچوون لەو گوتارەیە کە کە ڕەگەزە سەرەکییەکانی بریتین لە دین و نەریت و کلتووری مێژینەی ڕەخنە نەکراوی ژن-دیلکەر و دەسەلاتی پیاوسالاری، هەر هەموو بە کۆی خۆیان، ژنان لە ڕووبەرەکانی ئازادی و چالاکی و یەکسانی ماڤ دوور دەخەنەوە، قانع دەڵێت:

**عاجز و مەلوول، دایم خەمبارین**
**هەتا مناڵین زەلیل و خوارین**
**گا، زەجرو لێدان، گا بە ڕووت و قووت**
**چڵکن و پڵکن وێنەی مەلەکولمەوت**
**گەر بڵێم ئەمشەو ئەچمە سینەما**
**ئەڵێن تۆ کچی حەیات بۆ نەما**
**ئەوەڵ تا ئاخیر، ئێمە هەر دیلین**
**ژیان سووتاو و، زارو زەلیلین**
**یا دەڵێت:**
**کەلە دایک بوو ئاهەنگی نییە**
**ئەڵێن ئای کچە! فائیدەی چییە؟**
**سەدساڵ نەخۆش بێ، نابینێت دەرمان**
**لەجێی دڵخۆشی، هەر چەپۆک لێدان**

دوو چەمکی گرنگ و شیاوی ڕامان (دین و کلتووری پیاوسالاری)، هەردووکیان لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی دیسکۆرسی زاڵی سەردەمن و دەخوازن سەرجەم جومگە و پەیوەندییەکانی کۆمەڵگا ملکەچی ڕاستەوخۆ و بێ ئەملاو ئەولای خۆیان بکەن، ئەم دوو چەمکە لە لایەن (قانع)ەوە بە وردی و وشیارییەوە دەکەونە بەر خوێندنەوە و لێکدانەوەوە.
ملنەدان و هەر ئەم جۆرە هەڵوێست و خوێندنانەوەیە کە قانع دەکاتە ڕەخنە گرو شاعیرێکی زەمەنشکێن و لە سەردەم و زەمانی خۆی تێدەپەڕێت و لە هەنووکەشدا ڕەخنەکانی لە کۆی پەیوەندی و جۆری ژیانی زێدمان و چەوسانەوەی ژن و غاییبوونی ئازادی و بەرابەری لە مافدا کاران.
قانع ڕەخنەکانی و خوێندنەوەکانی تەنیا بۆ دەرچوون لە دۆخی هەنووکە نییە و باش دەزانێ کە بە تەنیا ڕەخنە لە دۆخی ئێستا بۆ خۆی بنەمای سازدانی گوتارێکی تازەیە لە پەراوێزان و دەنگ نەبیسراوان و نەبینراوان و بە شەفافیش بۆی ڕوونە دەرچوون لە ئیستا و پێکهاتەی خوو پێوە گیراو لە زۆر بەستیندا شڵەژان دەهێنێت.
هەموو نوێیەک لەگەل خۆی، ئازارو شڵەژانێک دەهێنێت. هیچ نوێبوونەوەیەکیش بێ ڕەخنە نەبووە. کەوابوو ڕەخنە خۆیشی یەکێک بووە لەو بوون و دیاردانەی کە هەر هەنووکە نوێیەو مەودا یا مافی ئەوەی نییە بە هیچ بەهانەیەک خۆی لە ڕەخنە دەرباز کات و، سەرووتر بزانێت.
هەموو ئەو ئازار و چەرمەسەری و نەهامەتیانەی کە بوونی قانعیان کردبووە ئامانج، لە ڕاستیدا، بەرئەنجامی ئەو شڵەژانە بوو کە فەرمانڕەوایانی دین و دەسەلات لە ڕەخنەکانی قانع بەسەریاندا دەهات و ئاوها کاردانەوەیان هەبوو، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەمەیە کە ئەگەر بە شێوە



گەلیلەڕەخنە باوەڕ بکەین کە خۆیان سەرقاڵی لێکدانەوە و شرۆڤەی بابەتەکانی بوون کردووە وەک ڕەخنەی هاوشان. ڕەخنەی ناهاوشانیش هەر خۆی ئامرازێکە کە دەکرێ بکەوێتە بەر خوێندنەوەی پڕ پرسیاری ڕەخنەگرانەی ڕەخنەو ئەقڵی هۆشیارەوە. بۆیە قانع سەرەرای سەرسامبوونی بە خەباتی نەتەوەیی و چینایەتی و هەموو خۆزگەکانی بۆ کۆمەڵگای دادوەر، یا بە واتایەکی دی، سۆسیالیستی، بەڵام هەرگیز ئەم چەمکانە وەک دوو چەمکی چەقیو و دەقگرتوو نەگۆڕ و سەرووتر لە ئازادی و مرۆڤ نابینێت. بۆیە لە مارسلینی بڵندی ئازادی خۆیدا، ئاوەها دەڵێت:

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بە ندیخانەیە
ئە م کەلەبچە مەرهەمی زامی دڵی دیوانەیە
زور دەمێکە چاوەڕوانی زرزرەی زنجیر ئەکەم
سەیری ئەم زنجیرە کەن وەک زیوەری شاهانەیە
بووکی ئازادیم ئەوێ خوێنم خەنەس بو دەست و پێی
حەلقەحەلقەی پێوەنم بو پلپڵەو لەرزانەیە
گەرچی دوژمن وا ئەزانی من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم، قوتابیخانەیە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قور بە سەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
توپ و شەستیر و کەلەپچە لام وەکو ئەفسانەیە
چاوەڕوانی شوڕشێکم عالەمی ڕزگار بکا
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە
چەکی شوڕشگێڕیی من، نووسین و بیر و باوەڕە
ڕاپەڕینە، هەڵمەتە، پر نەعرەتەی کوردانەیە
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە
قانعم ئەمرۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم
سەدهەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە

لەم دەقەی قانعدا کۆی بەهاو بابەتە گشتییەکانی مرۆڤ، ئازادی، سەربەخۆیی نەتەوەیی، کۆمەڵگای دادوەر، لە هەموو شت گرنگتر، ئازادی ڕەها و نا بارگاوی و دەستەمۆ کراوە بە ئایدۆلۆژیاو بە چەق و سەرووترکردنی هیچ ئایدیایەک نابینرێ کە
بتوانێ ئەمانە لە خۆیداو لە پەراویزدا مۆنۆپۆل کات و ڕابگرێت.

ئەگەر لێرەدا بڵێم قانع جگە لە وشیاری و ڕەخنەگری، ڕووناکبیرێکی سەردەمەکەی خۆی بوو، پێم وا نیە قسەیەکم کردبێت کە لە جیگای خۆیدا نەبێت. ڕەنگە زمانی خەیاڵ و هاونشینیی وشەکان و وێنە شیعرییەکان و لێکچواندن و وەسف و کێش، تەنانەت سەرواکانی دنیای هونەری شیعریی قانع، جێگای مشت و مڕی زۆرتر بن و ڕەخنەی جدیتریش هەڵگرن، کە هەڵی دەگرن بەڵام دەبێ بزانین کە قانع شاعیرێکی فرەڕەهەندە و تەنیا بە یەک زمان و میتۆد، خوێندنەوەی جەفا بە قانع و بە ئاوەز و ڕەخنەیە. لای من، ئەوەی زۆر گرنگ و شیاوی سەرنجە لە لای قانع، هیچ دیاردە و بوون و دەق و داهێنانی بۆ بە پیرۆزکردنی خۆی، یا دیاردەیەک نییە، بە تایبەتی دەقی ڕەخنەیی. کەوابوو هەموو ڕەخنەکانیش شیاوی ڕەخنەکردنن. ئەم تایبەتمەندییە و کۆی تایبەتمەندییەکانی دیکەی قانع، کە شەیدای ئازادی و دادوەری و بەرابەری ماف و مرۆڤ و باوەڕە، قانع دەکەنە ڕووناکبیرێکی مەزن و کۆی ئەم تایبەتمەندییانەش لە تایبەتمەندییەکانی ڕووناکبیری هەنوکەش ناگات بە سەردەمی قانع.





# ئەندێشەی چاکسازی و پاکسازی لە ژیانی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی "قانع" دا

**هومایون صاحب**

دیاردەی ڕیا و ئاماژەکانی دینداری و بەندایەتیی ڕواڵەتی لە کۆمەڵگە ئایینیەکاندا، مێژوویەکی کۆنی هەیە و تەریبە بە مێژووی دەرکەوتنی ئایینەکە. گەڕانەوەی دیوی ئەخلاقی ئایین لە (شەریعەت، تەریقەت، حەقیقەت) بۆ مانا دروستەکەی خۆی، چەندین عارف و سۆفی و بیرمەندی بە مێژووی مرۆڤایەتی ناساندووە. زۆرن ئەوانەی لە مێژووی دینداریی کوردیدا مەشخەڵی ڕۆشنکردنەوەی ڕێگایان بەدەستەوە گرتووە و بوێرانە بە گژ هێزەکانی تاریکی و هۆبەکانی گەمژەکردنی کۆمەڵدا چوونەتەوە. تەنانەت لەنێو شیعری تەصەوفی و ئەدەبی عیرفانیشدا، شیعری کوردی پلاری خۆی گرتووەتە تەمەڵخانەکانی مزگەوت و تەکیە و خانەقا و دەیر و مەرقەد و هێما و ئاماژەکان لە (عەمامە و پەچە و عەبا و کەشیدە و چەفتە و مێزەر و کتاب و تەسبیح و خەرقە و پرچ و ڕیش و بەرماڵ و سیواک و...هتدی پەلامارداوە. ئەوکاتەی ئەمانە دەبنە ئامێر و هۆکاری کۆیلەکردن، پەیڕەوکارانێکی حساب ساخۆکەر دەبەخشنە کۆمەڵگا، بۆیە بەرامبەر ئەو زاراوانە بۆ گێڕانەوی بەها و دیوی واتادار و پەیامی عەشق و ئەخلاقیانەی ئایین، شاعیرەکان لە زاراوەی دژی ئەمانە، کەڵکیان وەرگرتووە. ئیتر شیعرە شیرینەکانی ئەدەبی

ئێمە لە خشت و بەیت و وێنەکانیاندا، بەجوانی جێیان بۆ (بادەو شەراب و زوڵف و خاڵ و ساز و ئاوازو چەلیبا و خاچ و زنار و ئاتشگەو.. هتد) کردووەتەوە.
تەنانەت بەخاتری سەرخستنی جەوهەر و ناوەڕۆک و دیوی ناوەوە و بەسەر ڕواڵەتبازی و ساختەکاریدا، زۆرجار فەزڵی واژەکانی نێو باڕ و مەیخانەکانیان داوە بەسەر واچە پیرۆزەکانی نێو ئاییندا و ئەو کاڵا و شمەکانەیان لە قومارخانەو باڕەکاندا بە گۆشەی چاوێک و قومێ بادە دۆڕاندووە. جا تێنەگەشتن لەم بارو سەرنج و ئەندێشەیە، لەشیعری کوردیدا، ناهەقی دەخاتەوە بەرامبەر زۆرێک لە شاعیرەکان و شوناسی دژی سروشتی خۆیانیان پێ دەبەخشێت.
لە سەدەی ڕابردوودا، قانع وەکو هەڵکەوتەیەک لە پانتایی خورافەی کۆمەڵگەی ئێمەدا دەرکەوت، بۆ ئەوەی کوردەواری بەرەو حەقیقەت و ڕۆشنایی ئاراستە بکات. داخەکەم بە ڕۆحی نوکتەگەریی کوشتمان و پشتی سەرگوزەشتەکانمان شەن و کەو نەکردو خوێندنەوەمان بۆ نەکرد. تەنانەت لەخۆوە بە خوت و خۆڕایی، چەندین مۆرک و ناسنامەی ئایدۆلۆژیمان ئاخنیە باخەڵی قاپووتە درێژو چڵکنەکەیەوە.
سەردەمی ژیانی قانع، ڕۆژگارێکی گەرم و پڕ لە کێشەی نەتەوەیی و چینایەتی بووە. زۆر وێسگەو شوێن بوونەتە دوکان و دەلالّیی ئەوەیان کردووە کە باری سەرشانی کۆمەڵی هەژاری کوردەواری قورستر بێت و قازانجیش بۆ باخەڵی زۆردارانی تەوەزەل و هیچ–نەکەر بێت. کۆتایی جەنگی یەکەم، کۆمەڵێ وێنەو نمای خستەوە کە سەرنجدانی لەسەر ڕووداوەکان سادەو خێراترکرد. هەربۆیە شێوازێک لە زمان و شیعریەتی قووڵ، بارگەی پێچایەوەو شێوازێکی ئاسوودەترو نزیکتر بە زمانی میللییەت هاتەئاراوە.
لە پێناو تێگەشتنی زیاترو گەیاندنی بەرفراوانترو زۆرترین بەردەنگ، کۆمەڵێ شاعیر زمانی شیعرو ئەرکی شیعرییان تەرخان کرد بۆ کێشە نەتەوەیی و چینایەتیەکان و هەندێ مەسەلەی سادە. شیعری نیو سەدەی ئەدەبی ئێمە، بێجگە لە پەیام و ئەرکە پیرۆزەکەی، وێنە و جوانییەکی ئەوتۆی تێدا نابینرێ، چەند نموونەیەکی دەگمەن نەبێت کە ناکەونە خانەی نووسینەکەی ئێمەوە.
بێکەس و قانع و موفتی و شاهۆ و ئەحمەد موختارجاف، لەو شاعیرانەن کەڵکەڵەی هۆشیاری و پێشکەوتن لە هەر شتێک زیاتر، لە کەللەی داون و هەمەڕەنگ هاتوونەتە گۆ و بە سادەترین زمان و حاڵ، خەڵکەکەی خۆیانیان دواندووە. ئەوەی قانع جیادەکاتەوەو زۆرتر دەیهێنێتە پێشچاو زیاتر دەیخاتە سەرزمان، مەلایەتیەکەیەتی. مەلایەک، کە ئەو هەموو دروشم و بانگانەی سۆشیالیزم بەرزدەکاتەوە و بە جۆرێ ڕێگای ڕزگاربوونی پاڵە و جووتیار و کرێکار و ڕەنجدەر دەگرێتە بەر. لە دواییدا شیعرەکانی دەبنە سروودی ڕێکخراوە مارکسی و لینیییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا لە بڕوابوون بە شەریعەتی موحەممەد، دوور نەکەوتووەتەوە و چاکیش زانیوویەتی ماوەی نێوان دوو جەنگەکە، ڕوناکبیری بریتی بووە لە مارکسیبوون و هەژموونی کۆمینیستی لەسەر بزووتنەوەی ڕزگاریی گەلان ڕۆڵی گێڕاوە. بۆیە ئەو لە سەنگەرەوە بە ڕۆشنبیرەکان دەڵێت:

**برای کوردم کە خۆت ناو نا منەوەر**
**بزانە بوغزی شەرعی مستەفا بەس**

گرنگە کە ئەو وەک مەلایەک هاتووەتە نێو پرۆسەی هۆشیاری و چاکسازی و پاکسازییەوە. لەکۆی تێگەیشتنی خەڵکە سادەکەی کوردەواریدا، کە ئەو زۆر تێکەڵیان بووە و زۆریش خۆشی ویستوون، ئەو زیاتر هەستی بەو ناحاڵیبوون و تێگەشتنە هەڵەیە کردووەو پێی وابووە لە جەهل و نەزانینی کۆلکە مەلاکانەوە کەوتووەتەوە. بۆیە قورسایی خۆی لە هۆشیارکردنەوەدا دەخاتە سەر کایەی ئایین و ڕاستکردنەوەی ئەو دۆخە کەڵەکەبووە کە ئەرک و زەحمەتێکی لە ڕادەبەدەری ویستووە.



تەنانەت ڕەفزکردنەوە و ڕەتدانەوەی مەلایەتی و مەلا، بوونی لەو ڕۆڵە خراپەی مەلاوە وەرگرتووە، بۆیە هۆشیاری دەداتە نەوەکانی، کە مەلایەتی نەکەن. بەو مانایەی کە نەبنە بایسی گێلکردنی کۆمەڵ و دواکەوتنی.

ئەو لای وایە ئەو جۆرە لە بڕوابوون و تێگەشتن لە ئایین لای کۆمەڵانی خەڵک، بە تایبەتی لای چینی هەژار، هەڵەیە و ئەوەی بە ئەنقەست ئەو ناحاڵیەتیەی بەرهەم هێناوە و چرای کوژاندووەتەوە، کاراکتەرە ئاینیەکان خۆیان بوون و لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان ئەمەیان کردووە، کە ئەوانیش شێخ و مەلاو حاجی و زاهیدو سۆفی و دەروێشانی ساختەن.

قانع وەک چاکسازێک پێی وایە حیجاب و مزگەوت و دەیر و کەنیسە و خانەقا و تەکیەکان، گەر بوونە مەقسەد، ئەوە تەجلیگای حەزرەتی حەق نین، بەرماڵ و جبە و عەمامە و مێزەر و تەسبیح و سیواک و کەشیدە و پرچ و ڕیش، گەر مرۆڤیان کردە دیلی خۆیان، ئەوە دەبنە پێوەنی گیان. بۆیە کارەکتەرە دینیەکان (حاجی، مەلا، شێخ) وەک قازانجکەرانی دەسەڵاتی ئایین و هاوکات (بەگ، ئاغا، خان، سەردار) وەک قازانج دیتوانی دەسەڵاتی ماددی، لە شیعری قانعدا، هێرشیان دەکرێتە سەر و بەر پلارو توانج و تەشەر دەدرێن. کەچی قانع دواجار پێی وایە لە مەیدانی ڕزگاری و گەشتنە ئامانج و ڕۆژگارێکی باشتر، دەبێت مرۆڤ دەست لە هەجووی هاوزمان و هاوئایین و هاوڕەگەزو مرۆڤە خراپەکانی کۆمەڵگەکەی خۆی هەڵ بگرێت و لەو مەیدانەدا جۆرێکی تر لە خەباتی چاککردن و ڕاستکردنەوەیان بگرێتە بەر:



ئەگەر قانع ئەتۆش مەردی لە مەیدان

بەسە، هەجووی هەموو قەوم و برا بەس

قانع لە درێژەی ئەزموونی ژیانی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی خۆیدا، بە گژ ئەو مۆدێلە لە وێناکردنی توانست و دەسەڵاتی خوا و حوکم و فەرمانەکانی و ڕێساکانیدا دەچێتەوە کە شەریعەتێکی زۆر تەنزاوی مەخسەرەئامێز و ناعەقڵانی خوڵقاندووە. بۆیە هەردەم وەک جۆرێ لە مەخسەرە پێکردن و گاڵتە دێتە بەرامبەر تێگەشتنە هەڵەو باوەکان. ئەمەش بووەتە مایەی بەرهەمهێنانی ئەو گیانی نوکتەگەرییەی کە قانعی بە ئاسانی پێ دەناسرێتەوە. ئیتر لەو پێناوەدا ئەو هەموو شیعرە سادەو لە ڕاستیدا زۆرجار پڕ ئامۆژگارییانەی بە ئەدەبی نوسراوی کوردی بەخشیوە. کە وەک شیعرییەت، لێدوان هەڵناگرن. بۆیە لێکۆڵەری شیعری قانع، زیاتر لەسەر مەسەلەکانی دەرەوەی شیعریەت باس دەکات، کە زمان و گیانی شیعرەکەی بۆ کراوەتە قوربانی. تەنانەت ئەو، لە ژیانی سادەی ڕۆژانەیدا، هەمان ئەو ئەرک و ڕۆڵەی کە بە شیعر دەیگێڕێت، بە نوکتە و قسەی خۆش و توانجی بەهێز گێڕاویەتی.

با لەم دوونموونەیە بڕوانین:

-1جارێکیان مامۆستا قانع لەدێی کاڵ دەبێت، دەفێک بە دەستی دەروێشێکەوە دەدڕێت، دەڵێن؛ دەفەکە شەهیدبوو. مامۆستاش بەدەف ژەنەکە دەفەرموێ: تۆ موسڵمانیت؟ دەڵێت بەڵێ. قانع دەڵێ: دەی تۆ ئەو دەفەت دڕاند و گوتیشت کە کافریش نیت. کەسێ شەهید بکرێ، دەبێ کافر شەهیدی بکات.

-2 مامۆستا وریا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: باوکم لە پێنجوێن لە دوکانی حاجی عەلی زەڕنگەر دادەنیشێت. کابرایەکی تەزبیحفرۆش دێتە بەردەمی و دەڵێت تەسبیح بکڕە. باوکیشم دەفەرموێ نامەوێ. کابرا دەڵێت سەد و یەک دانەییە و زۆر پێویستە. باوکم دەڵێت: نامەوێ. کابرا دەڵێ: یاشێخ، کاتێک تەهلیلە دەکەیت، ئەگەر تەسبیح نەبێت، لێت تێک دەچێ و نازانی چەندە؟ باوکیشم دەفەرموێت: جا بۆچی خاڵۆ من گوێز بە خوا دەفرۆشم تا بۆی بژمێرم و لێم تێک نەچێت!

قانع لە ناسینی خێڵ و عەشیرەتی کوردەوە،

زۆرچاک پەی بە عەقڵی عەشیرەتگەری و ناوچەگەری و تەعەسوبی جۆرا و جۆری بردووە، کە بەداخەوە لە ئێستادا شارچییەتی و شارگەریشی بە کوێرانە هاتۆتە سەر:

تەعەسووب لابەرن بەزمی عەشیرەتکاری توونا کەن
بچێن فیکری وەحدەت بەسیەتی هەنگاوی کوێرانە.

دواجار دەڵێین گەر بەویژدانەوە لە ئەدەبی قانع بڕوانین و ئەو هۆکارو تەنگەژانە چارەسەر بکرێن کە ئەو شیعری خۆی بۆ تەرخان کردووە، ئەوە چەند نموونەیەک دەست دەخەین کە باوەڕمان پێ هەبێت، چونکە ئەویش دەیتوانی خاوەنی زۆرترین شیعری بەرزو جوان بێت. ئەو بە هۆشیاریەوە شیعری داگرتووتە خوار و خستوویەتیە خزمەتی گرفتی کۆمەڵەکەیەوە. گەر بە پێوەرە هونەرییەکان و ستاتیکا ئەوە خەتا بێت، ئۆباڵەکەی دەکەوێتە سەر ئەو وەرچەرخانە کە ڕێبازی ڕیالیزم، بە ساکاری و ڕووکەشانە، هێنایە ئەدەبی کوردیەوە و چەند دەیەیەک ئەدەبی کوردی بەرەو دورشم و هوتاف-کێشان برد.

با سەرنج لەم شیعرانە بدەین:

چ ئومێدی بوو یارەبی بە تەنیا یەک نەزەر قانع
بە سوڵتانی خەیاڵات و بە شاهی شاری ڕەی کردم
ل 177

گەلێ مەمنوونی بەختم بووم بە لاری هاتە دنیاوە
تەناسوب جەلب ئەکا ئەبرۆ چلۆن قەت سەر لە مینبەر دەم ل 167

هەتا تاقی برۆی تۆ بێ لە بۆ سوجدەی سەحەرگاهم
لە مزگەوتی کەچ و کوڕ و لە میحرابی کەنارم چی
ل311

لە وەسفی ئەگریجەی خاوت، ئەگەر شیعرێ بە دڵما بێ
لە تەئسیری ڕەشی زوڵفت ئەبێ دڵ هەر زوخاڵی بێ
من و تۆ سێبەر و خۆرین کە تۆ هاتی ئەبێ بمرم
ئەزانێ قاعیدەی عیشقە کەسێ لەم بابە حاڵی بێ
ل303

ئەبێ یوسف گەلێ مەمنوونی قانوونی غەرامی بێ
کە ئاوێنەی جوانیی ئەو دڵی شۆخی زوڵێخایە ل 259

سەرچاوە:
1-دیوانی قانع، شاعیری چەوساوەکانی کوردستان. برهان قانع چاپی حەوتەم نشر پانیژ 1391
2-زایەڵەی زرێبار، ئەحمەد نەزیری، چاپی یەکەم 1382
3-شیعری سیاسی کوردی لە باشوری کوردستان، عەبدوڵا ئاگرین، چاپی یەکەم 1996



**تاهیر محەمەد عەلی:**



# قانع هیچ کاتێک خۆی لە شاعیرانی سەردەمەکەی بەکەمتر نەزانیوە

ئا: ئیدریس

نووسەر و مامۆستای زانکۆ دکتۆر تاهیر محەمەد عەلی، بابەتی دکتۆراکەی لەسەر قانع بووە و لە دووتوێی کتێبێکدا چاپ و بڵاوی کردووەتەوە، دەتوانین بڵێین دکتۆر تاهیر یەکێکە لە قانع ناسەکان و بە وردی شیکاریی بۆ ژیان و بەرهەمە شیعرییەکانی کردووە، لەم چاپێکەوتنەدا لە زاری ئەم نووسەرەوە زیاتر ئاشنا دەبین بە قانع.

**- لە ناو ئەو هەموو شاعیر و دەنگە جیاوازانەدا بۆچی بابەتی نامەی دکتۆراکەتان لە سەر قانع دانا.. بە کورتی دنیای شیعریی قانع، لای بەڕێزتان، چ بەهاو گرنگییەکی هەیە؟**

لەبەرئەوەی بابەتی نامەی دکتۆراکەم لەسەر قانع بووە، ماوەیەکی زۆر من وەکو مامۆستایەکی ئەدەبی کوردی کارم لەسەر شاعیرە میللیەکان کردووە، قانعیش یەکێک بووە لەو شاعیرە میللیانە کە من لە

ماوەی ساڵانی مامۆستایم لێکدانەوەو شیکاریم بۆ شیعرەکانی کردووە و لە ڕێگای ئەو لێکدانەوەو شیکاریانەوە بۆ شیعرەکانی، گەیشتوومەتە ئەو دەرئەنجامەی کە قانع لە سەردەمی ژیانیدا پێگەیەکی دیاری هەبووە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا و زۆر بەڕوونی درکی بە دەردە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگاکەی کردووە، زۆر بە لێهاتوویی و بوێرانە خاڵە گرنگەکانی ئێش و ئازار و چەرمەسەرییەکانی ناو کۆمەڵگای دیاری کردووەو هەڵوێستیشی بەرانبەر کارە دزێوەکانی نواندووە و ڕەخنەشی لەو بارە ناهەموارانەی کۆمەڵگای کوردەواری گرتووە کە بوونەتە هۆی تێکدان و شێواندنی بنەماو بنچینە و شیرازەی کۆمەڵایەتیی سەردەمەکەی.

ئەمانە هۆکار بوون بۆ هەڵبژاردنی نامەکەم، قانع لەگەڵ ئەوانەشدا هەموو ڕێگایەکی گرتۆتە بەر بۆ هۆشیارکردنەوەی میللەتەکەی و ژیانی خۆی خستۆتە گەڕ بۆ سەرفەرازی و سەرکەوتنی نەتەوەکەی و ڕزگاربوونی نەتەوەکەی لە دەست چەوساندنەوەو کۆنە پەرستی و کۆیلایەتی. ئەم ڕێگایەی کە قانع گرتبوویە بەر، چەندین جار تووشی گرتن و ڕاونان و چەرمەسەریی زۆری کردووە لە ژیانیدا.

یەکێکی تر لە کارە گرنگەکانی قانع بایەخدان بووە بەخوێندن و خوێندەواری و هەوڵی داوە ڕۆڵەکانی گەلەکەی، بەبێ جیاوازیی نێر و مێ، ڕوو لە خوێندن بکەن، هانی داون و تێی گەیاندوون کە تاکەڕێگا بۆ ڕزگاربوونیان لە ژێر دەستی و کۆیلەیەتی هەر خوێندنە، ئەمانە کۆمەڵێ هۆکار بوون کە پاڵنەر بوون بۆ ئەوەی کار لەسەر شیعرەکانی قانع بکەم.

**– بێگومان شیعری قانع لە ناو فەزای گوندییانەی کوردەوە سەری هەڵداوە و شیعرەکانی ئامرازێک بوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی زوڵم و چەوساندنەوەی جوتیاران لە لایەن دەرەبەگەکانەوە، پێت وایە لەم قۆناغەی ئێستادا بتوانرێ بە هەمان تێگەیشتنەوە شیعرەکانی لە لایەن خوێنەرەوە وەربگیرێن و کاریگەرییان وەک سەردەمی خۆی هەبێت؟**

بێگومان شیعری قانع لە فەزای گوندنشینەکانەوە سەری هەڵداوە، چونکە قانع وەکو شاعیرێک تەمەنێکی سەخت و ژیانێکی پڕ لە کوێرەوەری و ئازاراوی چەشتووە، تووشی دەیان کێشەو گیرو گرفت و دەربەدەری و نەبوونی بووەتەوە، بەدوای بژێوی ژیاندا شارەو شاری کردووە و لەو پێناوەدا دەیان کاری جۆراو جۆری کردووە. لە ڕێگای ئەو ژیانەوە، شاعیر بە قووڵی هەستی بە ئازارو ژیانی زەحمەتێکشانی نەتەوەکەی کردووە، بۆیە داوای یەکگرتن و یەکڕیزییان لێ دەکات و پێیان دەڵێ بە هۆی یەکێتی و یەکگرتنیانەوە ژیانی خۆشگوزەرانی و سەرفەرازی دێتە دی. قانع وەکو شاعیرێکی هۆشیار و ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی، بەباشی لەو سەردەمە گەیشتووەو ئەمەی زانیوە کە دەرەبەگی ئەو زەمانە، لەگەڵ ڕژێمی پاشایەتی و ئیمپریالیزمدا، یەک بوون و کلکی ئەوان بوون، بۆیە هەمیشە شاعیر بە شیعرەکانی دژیان وەستاوەتەوە و هانی کۆمەڵانی خەڵکی داوە کە بەرەنگاریان ببنەوەو دژیان بوەستنەوە. بێگومان ئەم کارانەی لە ڕێگای شیعرەکانییەوە کردووە.



قانع سۆزی هەژارانی نەتەوەکەی لە سۆزی کوردایەتی جیا نەکردۆتەوەو بە یەکی زانیون و کوردایەتی بە کاری جووتیاری کورد زانیوە و سەرکەوتنی جووتیاری بە سەرکەوتنی کوردایەتی دیوە.

**– ئەگەر بکرێ باسی ئەو تایبەتمەندییانە بکەیت کە شیعری قانع لە شیعری ئەوانی دیکە جیا دەکاتەوە؟**

ئەو تایبەتمەندیانەی کە شیعری قانع جیا دەکاتەوە لە شیعری شاعیرەکانی سەردەمی خۆی، بریتییە

له زمانی شیعری لای قانع، که زمانی سادەو ساکاری خەڵکییە، زۆربەی شیعرەکانی پێ نووسیوە، تاوەکو خوێندەوارو نەخوێندەواری نەتەوەکەی، لێی تێبگەن و کاریان لێ بکات و هەڵگری موعاناتی هەموان بێت. بەو زمانە شیعرییە نووسیویەتی کە ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەدەبی میللی، جگە لە هەندێ تایبەتمەندیی میللیی دیکەی شیعری قانع کە بریتین لە:

1 قانع وەک شاعیرێکی دڵسۆزو خەمخۆری کورد، شیعری بۆ نەتەوەی کورد هۆنیوەتەوەو لەگەڵ بەسەرهات و کارەسات و ڕاپەڕین و شۆڕش و دەستکەوتەکانی کورددا ژیاوەو هەڵسوکەوتی کردووە.

2 لە شیعرەکانیدا تاوانی شکستی هەموو ڕاپەڕینەکانی نەتەوەکەی خستۆتە ئەستۆی کۆنەپەرستیی ناوخۆ و دەرەکی ئەو سەردەمەی کە قانعی تێدا ژیاوە.

3 هەمیشە لە شیعرەکانیدا دژی دەرەبەگ و ئاغاو ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی بووەتەوەو هەمیشە لەگەڵ ئازارو ئاواتی چەوساوەکانی نەتەوەکەیدا بووە و داکۆکیکاری سەرسەختی چەوساوەکان بووە.

4 شیعرەکانی قانع لە ڕۆژگاری جەنگی جیهانی دووەمدا زۆربەی شیعرەکانی لەگەڵ جوتیارو کرێکارو شوانکارە و هەڵگری ئێش و ئازارەکانیان بووە داوای یەکگرتنی لە هەموو چینەکانی کۆمەڵی کوردەواری کردووە.



5 ناوەڕۆکی شیعرەکانی، ناوەڕۆکێکی پڕبایەخ بووە، هەموو چینەکانی کۆمەڵ بەئاسانی لێی تێگەیشتوون و هەڵگری موعاناتی هەموان بووەو شاعیرێکی بەرهەڵستکارو داکۆکیکار بووە لە مافی چەوساوەکانی کوردستان.

– زۆرێک لە شاعیران بە ئێستاشەوە کاریگەریی شیعریی خۆیان بەسەر هاو–نەوە و نەوەی دوای خۆشیان داناوە، دەکرێ پێمان بڵێیت ئەو کاریگەرییە شیعرییانە کامانەن کە قانع لەسەر شیعری هاوسەردەمی خۆی و پاش خۆی دایناوە؟

کاریگەریی شیعری قانع لەو سەردەمەی قانعدا بریتی بووە لەوەی کە قانعیش وەکو کەسێکی هۆشیار و خوێندەوارو ڕۆشنبیرێکی لێهاتوو، درکی بەو ڕاستییە کردووە وەکچۆن شاعیرانی هاوچەرخ هەوڵی ئەوەیان دابوو کە میللەت خوێندەوار بێت، ئەمیش لەو بارەیەوە هەوڵێکی چاکی داوە، چونکە بە لایەوە هەر کۆمەڵ و میللەتێک نەخوێندەواری و نەزانین باڵی بەسەردا کێشا، ئیتر ئەوسا داگیرکەر بەئاسانی دەتوانێت دەسەڵاتی بەسەردا بگرێ. بۆیە قانع هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە کە میللەتەکەی لەو دەردە کوشندەیە بەئاگا بێتەوە و لەو تاریکستانی نەزانینەوە بیانپەڕێنێتەوە بۆ جیهانی زانست و زانیاری، قانع شارەزاییەکی باشی هەبووە لە زمانی عەرەبی و فارسیدا و ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکی باشی هەیە لە شیعرەکانیدا و گرنگی و بایەخی بە وێنەی شیعری داوە و ڕەنگی داوەتەوە لە شیعرەکانیدا. هەروەها قانع هیچ کاتێک خۆی لە شاعیرانی سەردەمەکەی بەکەمتر نەزانیوە، بەڵکو هەوڵی داوە کۆمەڵێک پێنجخشتەکی لەسەر شیعری شاعیرەکانی سەردەمی خۆی و هی پێش خۆی دابنێت. ئەمە ئەوەمان پێ دەڵێت کە شاعیر شانازی بەوەوە بکات لەسەر بناغەی شیعری ئەو شاعیرە، پێنج خشتەکیی داناوە. قانع لە سەردەمی خۆیدا، کاریگەری تەواوی هەبوو، بەڵام بۆ ئێستا دەورو زەمان گۆڕاوە ڕەنگە ئەو کاریگەرییەی ئەوسای، لەسەر کۆمەڵ، نەبێت.

**– قانع لەسەر زۆرێک لە بابەتەکانی وەک نیشتمانی و چینایەتی و ئاینی و دڵداری و کۆمەڵایەتیی**

**نووسیوە، بە ڕای بەڕێزت لە کام بابەتیاندا زیاتر سەرکەوتوو بووە؟**

ئەو بابەتانەی کە قانع شیعری لەسەر نووسیون و بایەخی پێداون؛ وەکو نیشتمانی و چینایەتی و ئاینی و دڵداری و کۆمەڵایەتی و پێنج خشتەکی و دیالۆگ و هونەرەکانی ڕەوانبێژی... هتد. قانع سەرکەوتوو بووە لە هەموو ئەو بابەتانەی کە کردوونی بە هەوێنی شیعرەکانی. ئێمە ناتوانین بڵێین شاعیر ئەم بابەتەی سەرکەوتووترە لەو بابەتەی دیکەی، هەر بابەتێک کە شیعری لەسەر نووسیوە بایەخی تایبەتی خۆی پێ دراوە و چووەتە قووڵایی بابەتەکەوە. ئەویش لەبەرئەوەی کە ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتوخوازی سەردەمەکەی خۆی بووە.

بۆ نموونە بایەخدان بەلایەنێک لە لایەنە کۆمەڵایەتییەکان کە ئەویش ئیشکردنە. کارکردن بە لای ئەوەوە، بایەخێکی گرنگ و تایبەتی خۆی هەیە، هەموو دەم شاعیر هاواری بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی ئەوە بووە کە کار بکەن، چونکە بەلای شاعیرەوە ئەو نەتەوەیەی ڕۆڵەکانی کار نەکەن، نەتەوەیەکی ژێردەستەو دواکەوتوو دەبێ. بۆیە قانع داوایان لێ دەکات کە هەموو کار بکەن لە پێناو سەرکەوتنی ژیانی کۆمەڵدا. شاعیر خۆی، لە ژیانیدا، کاری زۆری کردووە، بەڵام یەکێک لەو کارانەی کە بە لایەوە زۆر خۆش بووە ئاشەوانێتی بووە.

کەواتە کارکردن بەلای قانعەوە گرنگی و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. شاعیر لە ژیانیدا کاری کردووە، بێئەوەی دەست لە کەس پان بکاتەوە، ئەمەش نەفس بەرزێتی شاعیرمان پیشان دەدات.





# ڕەهەندەکانی پرسیار لە شیعری قانع دا

حەمە مەنتک

ئایا تەنێ مرۆڤ دەتوانێ پرسیار بکات؟ ئایا پرسیارکردن تاکە خەسڵەتی مرۆڤە وەکو بوونێکی خاوەن عەقڵ؟ ئەدی باشە، کاتێ ئاژەڵێک شتێکی نامۆ و سەیر لە دەرەوەی سروشتی خۆی دەبینێت، بۆچی هەڵوەستە دەکا و تێی ڕادەمێنێت؟



مرۆڤ تاکە بوونە کە دەتوانێ پرسیار بکات، هاوکات وەرامیش بداتەوە. بۆیەیش فەلسەفە و ئایین هەر لە خودی ئەو پرسیار و وەرامانەوەی مرۆڤەوە پەیدا دەبن. هەرچەندە دەکارێ جیاوازیی نێوان فەلسەفە و ئایین زۆر بە سادەیی لە عەقڵ و مێتافیزیکدا ببینین. واتە فەلسەفە پتر عەقڵییە، ئایینیش مێتافیزیکی. هەموو ئەو پرسیارانەی مرۆڤەکان نەیانتوانی لەڕێی عەقڵەوە وەرامێکی بۆ دەست بخەن، پەنایان بۆ وەرامی ئایینی برد. یەکێ لە تیۆرەکانی دروستبوونی ئایین بۆ ئەم هۆکارە دەگەڕێتەوە. هاوکات فەلسەفە

لەسەر گومان کار دەکات. وەکو "هێراکلیس" دەڵێت: گومان لەوەیش دەکەم، کە گومان دەکەم. کەواتە مرۆڤ بوونێکە، هەمیشە پرسیاری هەیە، چونکێ عەقڵیش تا شوێنێکی دیاریکراو بڕ دەکا، بۆیەیش هەمیشە پرسیاری دیکەی لە کن دروست دەبێت. پرسیار چەمکێکە، تەنێ لە کن فەیلەسووفەکان ئامادەیی نییە، بەڵکو لەکن هەموو مرۆڤێک هەیە. هەرچەندە شێوازی داڕشتن و شێوەی ئاراستەکردنی پرسیارەکە، لەکن ڕۆشنبیرێک و کەسێکی ئاسایی جودایە. شیعر قەت لە فیکر خاڵی نییە. دەمەوێ بڵێم شیعر وەکو کۆی ڕەگەزەکانی دیکەی ئەدەب، سوود لە هەموو زانستەکانی وەکو: کۆمەڵناسی، دەروونناسی، فەلسەفە...تاد وەردەگرێت.

شاعیر کەسێکی دابڕ لە کۆمەڵگا نییە. هاوکات کەسێکی کۆمەڵایەتییە. واتە تێکەڵی هەموو پرسێکی ناو کۆمەڵگایە. قانع یەکێکە لەو شاعیرانەی تەواو پێڕەوی لە ئایدیۆلۆژیای مارکسیی و چینی کرێکار دەکات. بۆیەیش هەموو ئەو شتانەی دەبنە پرسیار لەکن شاعیر، خاڵی نین لەو ئایدیۆلۆژیایە. ئەمە کاریگەری لەسەر پرۆسێسی شیعر دەبێ، چونکێ لێرەدا شیعر دەبێتە هۆکارێک بۆ گەیاندنی ئەو ئایدیۆلۆژیایە. بۆیەیش پرسیاری سەرەکیی شاعیر لە بارەی چینی کرێکار و جوتیارەوەیە.

یەکێک لە ڕەهەندەکانی پرسیار لەکن شاعیر، ڕەهەندی بەکەس-کردنی نیشتمانە. ئەو تەکنیکەی کە تیایدا شاعیر سیفەتی ئاخاوتن، یان زمان بە شتێکی بێگیان و مەعنەوی دەبەخشێت. بێگومان لێرەدا پرسیار دەکرێتە بەهانەیەک تا ئەم تەکنیکە دروست ببێت. ئەو بەکەسکردنە، یان زمان-پێدانە، دەبێتە پەیدابوونی دیالۆگ، چونکێ ئەو شتەی سیفەتی پەیڤینی پێبەخشراوە، دەتوانێ بیر بکاتەوە.

**ئەی خاکی وەتەن بۆچی نەما غیرەتی شێران؟**
**ئەی خاکی وەتەن بۆچی نەما بەزمی دلێران؟**

جەوهەری ئەم پرسیارانە و ئاڕاستەکردنی بۆ نیشتمان، لەسەر بنەمای ئەو ڕابردووە پڕ شکۆیەی کوردان دێت. شاعیر، کە دەنۆڕێ مێژووی بەرگری و ڕزگاریخوازی کوردان هەمیشە پڕە لە خەبات و ئازایەتی، کەچی دەبینێ ئێستاکێ ئەو جۆشخرۆشییەی جاران بۆ خەبات نەماوە. لێرەدا شاعیر ڕاستەوخۆ پرسیار لەو بارەیەوە ئاراستەی خەڵک ناکات، بەڵکو ئاراستەی خودی نیشتمانی دەکات، وەکو ستەملێکراوێک، چونکێ میللەتەکەی بە کەمتەرخەم دەزانێت. ئەم پرسیارانە بۆ شاعیر، وەرامێکیان نابێت. ناچار ڕاستەوخۆ پرسیار ئاراستەی میللەتی کورد دەکات.

**کوردینە! ئیتر خزمەتی ئەغیار هەتا کەی؟**
**شوێنکەوتنی بێگانەیی خونخوار هەتا کەی؟**
**دڵپاکی لەگەڵ عەقرەبی چزدار، هەتا کەی؟**
**هەڵگرتن و ماچکردنی ڕەشمار، هەتا کەی؟**

لە ڕێی پرسیارەوە دەیەوێت ڕابردووی میللەتی کورد هەڵبداتەوە، چونکێ شێوازی پرسیار بەرانبەرەکەت دەخاتە تێرامان و هەڵوەستەکردنەوە. بەدرێژایی مێژوو، لەناو کورددا کەسی خۆفرۆش و خزمەتکاری بێگانە و داگیرکەران، هەبوونە. بۆیەیش ئەمە دەکاتە پرسیار و ئاراستەی خەڵکی دەکات. ئەمە بە هۆکاری شکست و پێشنەکەوتنی میللەتی کورد دەزانێت.

قانع وەکو "نالی" لە شیعرێکدا دەکەوێتە دیالۆگ لەگەڵ کەرەکەی. ئەم شیعرەی لە لاپەرە (١٩٠- ١٩٢)ی دیوانەکەیدا هەیە. دیالۆگێکە لەنێوان خۆی و کەرەکەی. وەکو "نالی" سیفەتی عەقڵ بە کەرەکەی دەبەخشێت. لەبەرئەوەی کەرەکەی لێرەدا وەرامی پرسیار و پەیڤەکانی قانع دەداتەوە. لەڕێی ئاراستەکردنی پرسیارەوە دەیەوێ باروگوزەرانی خۆیمان بۆ بەرباس بدات. ئەمە ڕەهەندێکی دیکەی پرسیارە لە شیعرەکانی شاعیر. واتە پرسیار دەکاتە هۆکارێک بۆ پیشاندانی شێوە ژیانی خۆی. قانع لە وەرزی هاتنی زستاندا لە کەرەکەی دەپرسێت:

**شەوێ پێم وت چلۆنی یاری دێرین؟**
**ئەوا سەرما بزووت، دەستم بە دامان**



**ئیتر زستانە و کاتی دارکێشانە**
**وەکو سالانی پێشوو بێرە جەولان**

دواندنی کەرەکەی، بەخشینی سیفەتی عەقڵە، بەڵام نەوەک بەو واتایەی "نالی"، بەڵکو بۆ واتایەکی دیکە. دەبینین لەم دوو دێرەدا پتر ڕیتمی شیعری لەسەر وشەی سەرما و زستانە. زستان بۆ خێزانی هەژار ڕەوشێکی تایبەتە. دەمەوێ بڵێم لە زستاندا ئەو ماڵەی هەژارە، ناتوانێت پێداویستی خۆگەرمکردنەوە دابین بکات. هاوکات کار و کاسبی کەم دەبێتەوە. ئەوانەی ئێمە بەرباسی دەدەین سالانی سەردەمی شاعیرە. لەم دوو دێرەدا ڕاستەوخۆ وێنەی ماڵە هەژارێکمان دێتە بەر چاو. بەڵام هێشتا وێنەکە ناتەواوە. کەرە شین لە وەرامی قانعدا دەڵێت:

**وتی قانع! ئەسەف بۆ بێ حەیاییت**
**حەیا زۆر خۆشە بۆ پیاوی بە ویژدان**
**بە کام جێ؟ کام گەوڕ؟ کام ناڵ و بزمار؟**
**بە کام ڕەشووە و جل و بەند و کورتان؟**

لە وەرامی کەرەشیندا وێنەی هەژار و دەستکورتیی شاعیر تەواو دەبێت. کەواتە شاعیر بە مەبەست سیفەتی پەیڤینی بە کەرەکەی بەخشیوە. کەرەشین قانع بە بێ-شەرم دادەنێت، چونکێ حاڵی کەرەکەی لە خۆی خراپترە. کەرەشین گلەیی لە شاعیر دەکات، بەوەی ئەو نە گەوڕێکی باش، نە کورتانێکی چاکی بۆ دابین کردووە، نە ناڵی کردووە، ئیدی چۆن شەرم ناکات داوای لێ دەکا، خۆی ئامادە بکا، بچن بۆ داربڕین. شاعیر لەڕێی هونەری "خوازە"وە، ژیانی کەرەکەی نیشان دەدات. واتە ئەوە حاڵی ژیانی کەرەکەی بێت، ئاخۆ دەبێ هی خۆی چۆن بێ! ئەوەی دەمەوێ بیڵێم قانع ڕاستەوخۆ نەهاتوە ژیانی خۆی پیشان بدات، بەڵکو لە ڕێی ژیانی کەرەکەیەوە ئەمەی کردووە.



لە ژیانی قانعدا ئەوەی جێی سەرنجە، پێڕەویکردنە لە ئایدیۆلۆژیا مارکسی-لینینی. بەوەی دژایەتی دەرەبەگی دەکرد. هەمیشە هەوڵی دەدا پشتگیری جوتیار و کرێکاران بکات. بەڵام ئەوەی مایەی پرسیارە، ئایا شاعیر تەواو بەم ئایدیۆلۆژیایە ئاشنایە؟ ئایا لە هەموو چەمک و ڕەهەندەکانی گەیشتووە؟ یان وەکو زۆربەی پێڕەوانی ئەم ئایدیۆلۆژیایە لە کوردستان تەنێ وەکو دروشم تێی گەیشتوون. هێندەی ئەم دیوانەم شەنوکەو کرد، تەواو ئەوەم بۆ ڕوون نەبوویەوە، بەڵام قەناعەتێکم لەکن دروست بوو، شاعیر ئەم ئایدیۆلۆژیایەی تەنێ لە دژایەتی دەرەبەگ و بازرگان و پشتگیری لە کرێکار و جوتیار کورت کردۆتەوە. من دەزانم شاعیر بە هەندێ لە کون و کەلەبەری ئەم ئایدیۆلۆژیایە ئاشنایە:

کوردە وەرە بنوارە دەوای دەردت لە کوێیە
هەر پەیڕەوی لینینە، دەوا و چاری نەخۆشین

یان دەڵێت:

**هەڵگرن پاچ و بێڵ و قەڵەم**
**هەر لە ڕۆشنبیر هەتا شوان و سەپان**
**هەڵتەکێنن ئەم نیزامە بۆگەنە**
**دابڕێژن کۆشکی یەکسانی ژیان**
**ئەو دەمەش ڕۆڵەی پرۆلیتاری کورد**
**دەبنە ڕابەر بۆ وڵاتی کوردستان**

ئەوەی پتر ئەو قەناعەتەی چەسپاندم، شاعیر تەواو ئیماندارە، مەبەستم ئەوەیە شیعری ئاینیی هەیە. هاوکات لە زۆر شوێن ڕووی دەمی لە خودایە. لەلایەکی دیکە ئەم ئیمانداریيەی نەبووەتە ڕێگر لەبەردەم تێکۆشان.

دیالۆگی شیعری تەواو لەناو شێعرەکانی شاعیر ڕەنگی داوەتەوە. لە چەندین شوێن پشتی بە دیالۆگ لەگەڵ شتە بێگیانەکان، یان شتە مەعنەوییەکان بەستووە. دیارە ئەم هونەرەیش لە شیعردا بۆ ڕوونکردنەوەی جەوهەری ئەو شتەیە. بۆ نموونە لە شیعری "قانع و لێفەکەی"، دیالۆگ لەگەڵ لێفەکەی دەکات، لەوێدا باسی حاڵ و گوزەرانی خۆی دەکا. لێفەکەی سەربردەی مێژوویی خۆی

دەگێڕێتەوە، کە لە ئادەمەوە تاکوو ئێستا هاتووە. لەوێدا لەڕێی لێفەوە هەوڵی دەرخستنی ڕووی ڕاستیی ئاغا و بازرگانەکان دەدات. لە شیعری "جووتیار و گاجووتەکەی" هەمانشێوە هەوڵی پیشاندانی ژیان و ڕەنجی جوتیار دەدات.

ئەو شیعرانەی ئەو کە لە شێوەی دیالۆگن ئەمانەن: "قانع و باز"، "گفتوگۆی دوو بولبول"، "چیرۆکی پشیلە و مشک"، "سەرگووزشتەیەکی مێژوویی"، "کۆتر و ڕاوچی"، "لەگەڵ تاوسی تانجیدا"، "کۆلکە شێخێک و مەلەوانێک"، "لادێی و بزن فرۆشتن و هەڵبژاردن"، "دەمەتەقێی ن و س"، "لەگەڵ شاخی هەوراماندا"، "وتەی خەیاڵی لەگەڵ دارتوو"، "دڵداریی لادێ"، "قانع و گۆڕی موفتی پێنجوێنی"، "لەگەڵ گەنم"، "لەگەڵ شاری خورماڵ"، "لەگەڵ گردی سەیوان"، "سکاڵای نەسرین لای قانع".... تاد.

لە هەموو ئەم شیعرانەدا شاعیر یەکێک لەو بابەتانەی کردووە بە بەهانە تا مەبەستە شیعرییەکەی خۆی بڵێت. لەگەڵ ئەوەیشدا زۆربەی ئەم شیعرانە لەسەر بنەمای پرسیار دامەزراون. بۆ نموونە قانع لە شیعری "لەگەڵ گەنمدا"، پرسیار لە گەنم دەکات، کێیە ئاوا خزمەتت دەکا؟ خۆی پێتەوە ماندو دەکا؟ گەنم لە وەرامدا دەڵێ؛ ئەوە جوتیاری هەژارە. مەبەستی شاعیر پتر دەرخستنی ڕەنج ماندوبوونی جوتیارە، کەچی بەرەکەی دەرەبەگ دەیخوات.

قانع چەند شیعرێکی هاوشێوەی یەک دوو شیعری بەناوبانگی "نالی و مەحوی" نووسیووە. ئایا ئەو شیعرانەی بە مەبەست نووسیوە، یان بێ مەبەست؟ من لەوە دڵنیام قانع ئاگاداری شیعری ئەم دوو شاعیرە بووە. ئەو شیعرەی "نالی" لە بارەی کچەوە نووسیویەتی:

عیشقت. کە مەجازی بێ، خواهیش مەکە ئیلا کچ
شیرین کچ و، لەیلا کچ و، سەلما کچ و عەذرا کچ

قانع لەسەر هەمان کێش و قافیە، هاوکات هەمان تێمە شیعرێکی نووسیوە لە دژی یەکەمدا دەڵێت:

کوڕ بەبێ شک، هەوری تاڵە، هەر وەکو پەروینە کچ
کوڕ وەکو خاشاک و خارە، سۆسەن و ئەسرینە کچ

لەلایەکی دیکە و شیعرێکی دیکەی وەکو شیعرێکی "مەحوی" نووسیوە، کە دەڵێت:

کە من بۆم دەس نەدا ڕەندی، دە سا تەقوا نەکەم چی بکەم؟
ئەسیری زوڵفی تاتانم، کە واوەیلا نەکەم چی بکەم؟

چەندین شیعری بە پێنج-خشتەکی لەسەر شیعرەکانی "حافزی شیرازی" نووسیوە. لە کۆی هەموو ئەمانە، بە بڕوای من بۆ ئەوەیە، تاکو پێمان بڵێت، ئەویش توانای ئەوەی هەیە، شیعری هاوئاستی ئەوان بنووسێت. واتە شاعیر توانای شیعریی هێندە بەرزە، دەتوانێ وەکو ئەو شاعیرە گەورانە، بە هەمان تێمە و کێش و قافیەوە، شیعر بنووسێت. دەنا بۆ تەنێ هاوشێوەی ئەو شیعرانەی نووسیون، هاوشێوەی شیعرێکی دیکەی "نالی" نەنووسی. لەبەرئەوەی ئەو شیعرەی "نالی" یان "مەحوی" دیارە لەو سەردەمیش بەناوبانگ بوونە لەکن خەڵک و ڕۆشنبیران و ڕەواجیان هەبووە.

تێبینی

*بۆ شیعرەکان سوود لە: دیوانی قانع، کۆکردنەوەی بورهان قانع، وەزارەتی ڕۆشنبیری، بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی شەشەم، ٢٠٠٥. وەرگیراوە.





# ئەرکمان بەرانبەر بە قانع و دیوانەکەی

**سەڵاح سالار**



مامۆستا قانعی شاعیر (1898ـ 1965) یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی سەدەی بیست و کەسایەتییەکی هۆشیار و خەمخۆری میللەتەکەی بووە، هەر ئەو خەمخۆرییەشی بوو کە سەراپای ژیانی ئەوی پڕ کرد لە نەهامەتی و تا ئەو ساتەی کۆچی دوایی کرد ژیانێکی کولەمەرگی بەسەر برد و وەک لە دیوانەکەشیدا نووسراوە تەنیا 300 فلسی لەدوا بەجێمابوو.

ئەگەر تەماشایایەکی نازناوی شاعیرانی سەدەی بیستەم بکەین و خوێندنەوەیەکی سۆسۆلۆژیانە تەنیا بۆ نازناوەکانیان بکەین تێدەگەین

کورد لە چ مەینەتییەکدا ژیاوە. ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە تاکی کورد ژیانی پڕ بووە لە مەینەت و کوێرەوەری. بۆ نموونە: (بێکەس، بێبەش، بێچاو، بێدڵ، هەژار، ڕەنجەڕۆ، ناشاد، غەمگین، کەساس ... و) تد.

بەڵام قانع بە نازناوەکەشیدا پێمان دەڵێت ئەو بەو بەشە هەژاری و نەدارییەی کە خودا پێی بەخشیەوە قایل و قانعە.

ئەم شاعیرەی ئێستا لەسەری ئێستێکمان کردووە و دەمانەوێت دوای زیاتر لە چوار دەیە قسەیەکی وەفادارانە دەربارەی بکەین و وەک ئەرکێکی سەرشانمان لە خۆی و دیوانەکەی بدوێینەوە. ئەو کەسایەتییەیە بە شاعیری چەوساوەکان ناسراوە، تەواوی ژیانی ئەم پیاوە بە شیعر و هەڵویستی کرداریی و گوفتاریی و قسە نەستەقەکانییەوە لە خزمەتی چینی هەژاران و نەدارانی نەتەوەکەیدا بووە. بەهۆی ئەو هەڵوێستانەیەوە وەک خۆی ژیانێکی خۆشی نەبینی، کەچی بەداخەوە شیعرەکانیشی بەشێکی زۆریان فەوتاون و گومانم نییە بەهۆی ئەو هەموو کۆچ و بارە زۆرەی لەم ناوچە بۆ ئەو ناوچەی کوردستان کردوویەتی ئەوەندە شیعری تیاچووە کە لەوەی دیوانەکەی ئێستای زیاترە. هەروەها قانع نامەی شیعریی بۆ زۆر دۆست و هاوڕێ و ئاشنای خۆی ناردووە و لای خۆی کۆپیی نەکردوون و لای دۆستانیشی یان تا ئێستاش ماون، یاخود شیعرەکانیان لەبەرە و پارێزراون، بەڵام بەداخەوە نەگەشتوونەتە دەستی بنەماڵەکەی تا لە دووتوێی دیوانەکەیدا چاپی بکەن. هیوادارم ئێستاش درەنگ نەبووە و هەرکەس شیعری قانعی لایە بڵاوی بکاتەوە و لەهەر ڕێیەکەوە هەیە بیگەیەنێتە دەستی خانەوادەی قانع. من وەکو ئەرکێکی خۆم هەوڵی زۆرم داوە و توانیومە هەندێک شیعری قانع پەیدا بکەم کە هەندێکیان لە هیچ کوێ بڵاونەکراونەتەوە و هەندێکیشیان لە کون و قوژبنی ڕۆژنامە زۆر کۆنەکانی کوردستاندا پەیدام کردوون کە سەرجەمیان لە دیوانەکەی قانعی شاعیردا نین.

قانع ناوەڕۆکی شیعرەکانی سەرجەم بوارەکانی ژیانی گرتووەتەوە و هەوڵی داوە لە هەموو بوارەکانی: سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، تەنز و ... تد. بە شیعر ڕۆڵی خۆی بگێڕێت و هێندەی پێی دەکرێ هەوڵی داوە، بە شیعر نەتەوەکەی هۆشیار بکاتەوە و هانیان بدات بە گژی چەوسێنەران و کۆسپەکانی ژیاندا بچنەوە.

کاتێک کۆماری کوردستان لە شاری مهاباد ڕادەگەیەنرێ، قانع وەک نیشتمانپەروەرێک خۆی دەگەیەنێتە شاری مهاباد و بەشداریی کارا لە بواری ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی کۆمارەکەدا دەکات. لەوێ و لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستان کە زمانحاڵی حزبی دیمکوراتی کوردستان و هەروەها کۆماری کوردستانیش بووە، هەندێک شیعری نیشتمانپەروەرانە بڵاو دەکاتەوە. لە ژمارەکانی (68، 69، 70، 71، 73، 75، 76، 88). شیعری بڵاوکردووەتەوە، تەنانەت لە ژمارە (71)دا لەبری شیعرێک دوو شیعری بڵاوکراوەتەوە. ئەو شیعرانە سەرجەمیان (9) دانەیە و لەو شیعرانە چوار دانەیان لە دیوانی قانعدا نین. پێنج دانەشیان هەن بەڵام جیاوازییان هەیە و هەندێک وشە و دێڕیان جیاوازن و هەندێکجار بەیتێک پاش و پێشە لەگەڵ ئەوانەی ناو دیوانەکەیدا.



من لێرەدا لەبەر ئەوەی جێگای بڵاوکردنەوەی هەموویان نییە تەنیا ئەوانە بڵاو دەکەمەوە کە لە دیوانی شاعیردا چاپ نەکراون. هەروەها هەندێک شیعری دیکەشم لایە کە لە شارۆچکەی سەیدسادق نووسراون و تا ئێستا بڵاونەکراونەتەوە.

شیعری یەکەم: قانع و شەماڵ

قانع و شەماڵ1

بای شەماڵ مەردی خوابە هەڵکە سەروەی بەربەیان

بێرە سەر نرکە و گڤوگرمەت وەکو شێری ژیان

مژدە بە بۆ شار و لادێ و خێڵ و هۆبەی کوردەکان

جێژنی سەربەستی وڵاتە و ڕۆژی بەرزی نیشتمان

پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
جا[2] بدە بۆ کوردەواری بێژە ڕۆژت کەوتە دەر
مژدەبێ دەوری نەما دەردی دڵ، زامی جگەر
مژدەبێ ڕۆژیی نەما ترسی شەرەف، بیمی خەتەر
لابرا سێدارەکان و لابرا قەسری قەجەر[3]
پێشەوامان هەربژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
موددەعی خۆی پێ نەگیرا ڕووبەڕووی مەیدانی کورد
چونکی زووتر چێشتبووی نووکی ڕمی شێرانی کورد
موڵکی سەربەستی بە تاپۆدا لەدەس لاوانی کورد
جا لەمەولا بێرە سەیری مەعرەکەی مەیدانی کورد
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
لێدە تەپڵی بەزم و شادی بانگە بانگی الفرار
ڕاپەڕە و خۆت هاوە کۆڕ ناوەڕاستی کاروزار
شێر لە بێشە بێتەدەر عەیبە نەکا مەیلی شکار
کاکی کوردم نیشتمانت چاوەنوارە ئینتزار
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
هیممەتی قازی محەمەد پێشەوا و فەرهادی کورد
ڕۆشنی کردۆ لەنەو بنچینە و بنیادی کورد
خاکی ئازادی بەجارێک خستە دەست ئەولادی کورد
لاپەڕەی مێژوو دەنووسێ ڕۆڵە و ئیجادی کورد
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
خانی بانە حەزرەتی سەردار ڕەشیدی دارۆخان
فی الحقیقە بۆ نەجاتی هۆزی خۆی سەعی نوان
نایە لاوە موڵک و ماڵ و عائیلە و ڕۆح و ژیان
ڕۆستەمانە موکریانی کرد بە دەشتی مازندەران
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
شێخی کوردی حەزرەتی شێخ مستەفا وەک نەڕەشێر



خۆی و فەوجی بارزانی یەک لە یەکتر دەنگ دلێر
کۆچی خێری بۆ وڵاتی کوردەواری بوو بە خێر
تاقمی بەرزان و دوژمن هەروکو کارد و پەنێر
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
هەرکەسێ ئێرسێکی هەس، خوێنڕشتنە ئیرسی شکاک
شاهیدم سالاری سمکۆ چۆن موشەڕەف بوو بە خاک
دوژمنی عێلی شکاک هەر سەرشکاوە و سینەچاک
عومەر و تاهیر بژین بۆ گیان فیدایی ئاو و خاک
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان
قانعا خۆزگەم بەخۆت بۆ کۆمەڵ و پشت و پەنات
یەک لە یەک چاکترن خان و بەگ و شێخ و مەلات
سەیری کە چۆن تێئەچن بۆ گرتنی ڕێگەی نەجات
شادی مەرگی، چاکە بۆ تۆ، هاتە جێ گشت ئیددیعات
پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زوان

شیعری دووەم: شیوەنی قانع بۆ شەهیدبوونی محەمەد نانەوازادە

شینی قانع[4] بۆ قارەمانی کۆچکردوو نانەوازادە[5]
**کوردە وا دیسان شین و زاریمە**
**زایەڵەی چەمەر بێ قەراریمە**
**قارەمانی کورد زادەی کوردستان**
**نانەوازادە شێری نیشتمان**
**بۆ ئازادی کورد بە میهرەبانی**
**گیانی شیرینی کرد بە قوربانی**
**هەر ئەو شەربەتە شێخ سەعید نۆشی**
**دکتۆر فوئادی خستە سەرخۆشی**
**کە شێخ قادری ناردە ناو مێژوو**
**سمکۆی کرد بە کان و فاو ئابڕوو**
**ئەمیش ئەو پیاڵە ئەو مەزە ئەو مەی**
**ئەو بەزم ئەو بەسات ئەو شادی و هەی هەی**
**هەروا ئەو شەربەت ئاڵی گوڵناری**

**کرد بە نۆش گیانی بۆ فیداکاری**
**بە سووک نەڕۆیشت لاوچاکی پەسەند**
**پەترۆی6 زامانی خۆشەوی7 هەڵکەند**
**لە هەردوو چاوی کورد و کوردستان**
**فرمێسک ئەباریٚ تا ئاخر زەمان**
**باوجود ئەمە پێی ناڵێن مردن**
**لەڕێی ئازادی گیانبازی کردن**
**خوێنی شەهیدان بۆیە ناوەسیٚ**
**ترەی ئازادی هۆزی ئەنووسیٚ**
**وەتەن موژدەبیٚ قوربانیت زۆرە**
**قارەمانانت ئەیکەن بە نۆرە**
**سەد هەزار لاوان فیدای ناوەکەت**
**هاژەی نەسیمی سەر کەلاوەکەت**
**مەترسە تازە شکا زنجیرت**
**پێشەوای مەزن کەوتە تەگبیرت**
**تازە بەسەرچوو دەورەی ئیستیعمار**
**موژدەبیٚ کەوا هاتینە ڕووی کار**
**بێمەوە سەرباس جوانەمەرگەکەم**
**زووخاوی دەروون کزەی جەرگەکەم**
**کاتیٚ تەشریفی برد بۆ لای یاران**
**بۆ سەربەستی هۆز خۆی کرد بە قوربان**
**وەتەن بۆ بەروار ساڵی نەمانی**
**نەوی لە قەڵەم زۆر بە ئاسانی**
**بە پێی ئەبجەد هاتە گفتوگۆ**
**ئازیزا لاوچاک شێری شێران ڕۆ.**

شیعری سێیەم:
بەهۆی ڕۆژنامەی کوردستانەوە بۆ هەموو کوردان8

**ئەی کۆمەڵی کوردانە سەرم بیٚ بە فیداتان**
**سەد قەیسەر و دارا بە فیدای شاە و گەداتان**
**دەس بگرن بە یەک ڕووکەنە دەرباری خوداتان**
**بۆچ مات و کەژە شۆڕش و غەوغا و سەداتان**
**هەی من بە فیدای هەڵمەتی مەیدانی هەراتان**
**ئەم فرستەتە ئاخر نەفەسی کوردی هەژارە**
**گەر بێت و بفەوتیٚ چە بڵێم چونە دیارە**
**سووتاندنی دێهات و پەرێشانی شارە**
**گوێ بگرە چە گریان و چە فەریاد و چە زارە**
**وەک لەشکری تورکانە لەگەڵ کوردی براتان**
**تێکۆشە بەخوێنگەرمی هەتا ماوە حەیاتت**
**نەشکێنی لەبەر ترسی عەدو عەزم و سەباتت**
**خۆت کە بە فیدای کێو و کەژ و خاک و وڵاتت**
**شێرانە لەدڵ بگرە هەوای ڕۆژی نەجاتت**
**خۆتان ببنە خاوەنی هەیوان و سەراتان**
**ئەو ژینە چە ژینێکە ئەسیری ئەو و ئەم بی**
**ڕۆژ ڕەنجبەری بیٚ مایە و شەو گێژی ...9 بی**
**هاوسەرکەمی یاران و کز و مات و بەغەم بی**
**دنیا بگریی تۆ لە هەموو کەمتری کەم بی**
**دەک ڕەبی نەژیم سەیری بکەم ژینی وەهاتان**
**ئێوە کە کوڕی کوردی و وەکو بازی نزارن**
**بۆ کوشتنی بێگانە وەکو شێری شکارن**
**بۆ بەزمی فیداکاری لەناو گێتی دیارن**
**زۆر حەیفە کەوا ئێستە هەموو سەر کز و خوارن**
**دەستی من و دامێنی هەموو شێخ و مەلاتان**
**ئەی عێلی جەلالی بگرە دەستی شوکاکت**
**بەرزانی بە ئەو غیرەتە وەتەنی و پاکت**
**زەرزا  وەرە بنواڕە لەبۆ بێکەسی خاکت**
**بانە بگەرە هەرکی و بەگزادەی چاکت**
**ڕزگاری بکەن شاخ و دەرودەشت و چیاتان**
**قانع من و تۆیش چاکە کە هەر ڕوو لەخوا بین**
**بۆ فەتح و زەفەر ڕانەوەسین، دەس وەدوعا بین**
**بۆ کۆمەڵی لاوان قەزاگێڕی قەزا بین**
**هەروەک مەڕی قوربانی لە مەیدانی فیدا بین**
**تا شوێنی نەمێنیٚ لە جیهان جەور و جەفاتان**

ساڵی 1954 مامۆستا قانع لە قوتابخانەی سەیدسادقی سەرەتایی تێکەڵاو دەبێتە مامۆستای کوردی و ئایین، بۆئەوەی خوێندن لای قوتابییەکان شیرین بکات زۆربەی جار مامۆستا قانع شیعری بۆ دەخوێندنەوە و پێی لەبەر دەکردن، هەر بۆ نموونە لە پۆلی یەکەم ئەم شیعرە بۆ قوتابییەکان دەنووسێت و دەیکاتە هاندەرێک بۆیان تا حەز و



خولیای خوێندنیان زیاتر ببێت.
ئێمه ئەمساڵ له پۆلی دووین10
**وردیله و زرت و زیندووین**
**ساڵێ تر دەچینه سێ**
**ئیشمان دەکەین جێبەجێ**
**له سێشەوه بۆ چوار**
**هەر دەوەنەو بووه به دار**
تەنانەت مامۆستا قانع لەو سەردەمەدا وانەی به پیاوه بەتەمەنەکانی سەیدسادقیش دەوتەوه بۆ ئەوەی فێری خوێندەوارییان بکات.

ساڵی 1957 قانع مامۆستای هەمان قوتابخانەی سەیدسادقی سەرەتایی بوو، له نەورۆزی ئەو ساڵەدا شانۆگەرییەکی بۆ قوتابییەکان ڕێکخست، شانۆگەرییەکە دیالۆگ بوو له نێوان چەند قوتابییەکدا به شیعر، شیعرەکه خۆی نووسیبووی، هەر خۆیشی دەرهێنەری شانۆکه بوو. ناوەڕۆکی شانۆییەکه بریتیی بوو له پیاوێکی داربڕ که بێبەزەییانه دار و درەختەکانی کوردستانی دەبڕییەوه بێئەوەی هیچ سوودی ئەو دارانه بزانێت. لەو دیالۆگانەدا باس له کەڵکی دارەکان و هۆشیاریی ژینگەیی دەکات.
نەکەی هەی نەزان تەورێک بدەی لێم
سەرێک هەڵبڕه بزانه من کێم
من ئەو دارگوێزەم هەزار به هەزار
کولێره مەژگەم11 دەنێرن بۆ شار
مێزی نانخواردن میوانت منم
هەروەها تابووت ڕۆژی مردنم.
بەمشێوەیه دارگوێز چەند سوودێکی خۆی دەوت. پاشان داربڕیش دەیوت:
سوپاست دەکەم کڕنووش دێنم بۆت
وا تێتگەیاندم له قازانجی خۆت12
ئیتر ئام بەم شێوەیه شانۆگەرییەکه درێژەی دەبوو، بەڵام ئێمه هەموو تێکستەکەمان دەست نەکەوت.



پاش کودەتای چواردەی تەمووز و دروستبوونی حکومەتی کۆماری، گرنگیدان به قوتابخانەکان زیاتر بوون، لەو کاتەدا حکومەت کەپسوولێکی دەرمانی ناردبوو بۆ قوتابخانەی سەیدسادقی سەرەتایی، بەڵام قوتابییەکان بۆیان نەدەخورا. مامۆستا قانعیش به بەڕێوەبەری قوتابخانەکه و مامۆستاکان دەڵێت: وازیان لێ بێنن، من بەیانی چارەی بۆ دەدۆزمەوه، شەو له ماڵەوه شیعرێک لەسەر سوودی ئەو دەرمانانه دەنووسێت و بەیانی دەییات بۆ قوتابخانەی سەیدسادق و بۆ قوتابییەکانی دەخوێنێتەوه، ئیتر هەموو قوتابییەکان دەرمانەکان دەخۆن.
ئەمەش شیعرەکەیه:
**کەبسوولی تام و بۆنخۆش**
**زادەی فیکر و بیر و هۆش**
**هاوتای شیری پێویستی**
**که قووتمدایت ناوەستی**
**یەکسەر دەچیت بۆ خۆرگه**
**کەڵکت بۆ دڵ و جەرگە13**

با ئەوەش بزانین که قانع شیعری لای خەڵک هەیه و بڵاو نەکراونەتەوه، ئەوەش یەکێکه لەو مافانەی شاعیر بەسەر هەموو خوێندەوارێکەوه هەیەتی تا بیاندۆزێتەوه و چاپیان بکات. هەندێکجاریش دانەدانەیەک له شیعری قانع دەست نووسەرێک دەکەوێت و بڵاوی دەکاتەوه. بۆ نموونه چەند ساڵێک بەر له ئێستا شیعرێکی دیکەی قانع له ڕۆژنامەیەکدا بڵاوکرایەوه که بۆ (مەلا ساڵحی گوندی دۆڵەسوور)ی نووسیبوو، که گورگ گوێدرێژەکەی خواردبوو، ئەویش به پارچه شیعرێک بەسەری دەکاتەوه. بەداخەوه ئەو شیعرەم دەست نەکەوت، بەڵام ئەگەر جارێکی دیکه بنەماڵەی مامۆستا قانع دیوانی شاعیر چاپ بکەنەوه دەتوانن ئەو شیعره و زۆر شیعری تریش دەست بخەن و چاپی بکەن.
ئەرکێکی دیکەمان بەرانبەر به دیوانی قانع ئەوەیه

زۆر شیعری ئەو کە لە دیوانەکەیدا چاپ کراون بۆشاییان بۆ دانراوە، هەروەها هەندێکیان بە هێما و نیشانەی تایبەت نووسراون، هەندێکیشیان بە پیت وەک ئاماژەیەک بۆ ئەو کەس و ڕووداوانەی شیعرەکان باسیان دەکات نووسراون و چاپ کراون. ئەمانە گومانم وایە بەشی زۆریان ئەگەر نەڵێم هەمووشیان کاک وریا قانع زانیاریی تەواوی دەربارەیان هەیە، بەو حوکمەی کاک وریا لە هەموو کوڕەکانی شاعیر زیاتر لە باوکییەوە نزیک بووە و دەزانێت ئاماژەکان چین و لەگەڵ کێیانە. ئەو بۆشاییانە لە شیعرەکانی شاعیردا بۆ خوێندەواران بەتایبەت نەوەی دوای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو کێشە و گرفتە و هۆکارێکن کە خوێنەری ئەم سەردەمە چێژ لە شیعرەکان وەر نەگرێت.
جا هەندێک لەو ڕووداوانەی شاعیر باسی کردوون سیاسی و کۆمەڵایەتیین و ئیتر کاتی شاردنەوەیان بەسەر چووە. تەنانەت دیوانەکانی قانع کە لە پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی گەلەکەمانەوە چاپ دەکرێن هەر بەهەمان هەستیارییەوە چاپ دەکرێنەوە کە چاپی یەکەم لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا چاپکراوە و زۆر حەزەر کراوە لە درکاندنی زانیارییەکان. بۆیە ئەو ئەرکەش دەکەوێتە سەرشانی کاک وریا بە پلەی یەکەم و نەوەکانی مامۆستا قانع بە شێوەیەکی گشتی تا دیوانی قانع بە ناوەڕۆکێکی دیکە و خستنەڕووی هەموو ئاماژە و کەلێنە نهێنییەکانی ناو شیعرەکان چاپ بکەنەوە. تەنانەت دەبێت ئەو دیوانە نوێیە لێکدانەوەی بۆ شیعرەکانیش تێدا بێت و بەو سادەییە نەیدەنە دەستی خوێنەرێک کە ڕەنگە لێی تێنەگات.

__________


قانع

1 سەرچاوە: رۆژنامەی کوردستان (ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستان) ژمارە (68) پێنجشەممە 27ی پووشپەڕی 1325. 18ی ژوئیەی 1946. ل 3.

2 ڕەنگە ئەو وشەیە (جاڕ) بێت، چونکە وشەی (جا) مانایەکی نییە بۆ ئەو نیوەدێرە و وشەی (جاڕ) یش مانای تەواو دەدات. ڕەنگە ئەوە هەڵەی چاپ بێت.

3 بەڵام پاش ڕووخاندنی کۆماری کوردستان پێشەوا قازی محەمەد و سەرکردە و فەرماندەکانی کۆمار لەسێدارە دران و جارێکی تر پەتی سێدارە بۆ کورد هاتەوە گۆڕێ. هەروەها قانع بۆخۆیشی پاش 17 ساڵ لە نووسینی ئەو شیعرە بە بەندکراوی ڕێی دەکەوێتە زیندانی (قەسری قاجار). بۆیە ئەو دوو خۆزگەیەی شاعیر نەهاتنە دی.

4 سەرچاوە: رۆژنامەی کوردستان (ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستان) ژمارە (69) یەکشەممە 30ی پووشپەڕی 1325. 21ی ژوئیەی 1946. ل 3 و 4.

5 نانەوازادە ناوی تەواوی محەمەدی نانەوازدەیە و فەرماندەیەکی چەلەنگی سوپای کۆماری کوردستان بوو، لەکاتی ئەرکێکی سەربازییانەیدا لەسەر شیوی سەقز فڕۆکەکەی کەوتە خوارەوە و سووتا و گیانی بەخشی بە کورد و کوردستان.

6 پەترۆ: قەتماغە.

7 خۆشەوی، خەلیل خۆشەوی یەکێک بوو لە فەرماندە ئازاکانی سوپای بارزانییەکان و چەند ڕۆژێک بەر لە شەهیدبوونی نانەوازادە شەهید بوو.



8 سەرچاوە: ڕۆژنامەی کوردستان (ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستان) ژمارە (71) یەکشەممە 6ی گەلاوێژی 1325. 28ی ژوئیەی 1946. ل 4.

9 ئەم بۆشاییە لە دەقە ئەسڵییەکەی ڕۆژنامەی کوردستاندا هەر بەو شێوەیە. بۆیە ئێمەش وەک خۆی نووسیمانەوە.

10 سەرچاوە: کتێبی (سەیدسادق پایتەختی شارەزوور)، نووسینی: سەلاح سالار، کە دەستنووسە و هێشتا چاپ نەکراوە.

11 کولێرە مەژگە، خۆراکێکی هەورامییەکانە و زیاتر لە ناوچەی هەورامان دروست دەکرا. وشەی (مەژگە) وشەیەکی زاراوەی گۆران (هەورامییەکانە) و بە مانای کاکڵەی گوێز دێت. کولێرە مەژگە بەو شێوەیە دروست دەکرا ناواخنی هەویرەکە پڕ دەکرا لە کاکڵەی گوێز و بەشێوەی کەلانە دروست دەکرا.

12 سەرچاوە: کتێبی (سەیدسادق پایتخەتی شارەزوور) نووسینی: سەلاح سالار، کە دەستنووسە و هێشتا چاپ نەکراوە.

13 سەرچاوە: کتێبی (سەیدسادق پایتەختی شارەزوور) نووسینی: سەلاح سالار، کە دەستنووسە و هێشتا چاپ نەکراوە.



شیوەنی قانع بۆ کۆچی پیرەمیردی نەمر
سالی 1950

دیسان سەرلە نۆ ماڵ وێرانیمە
تەم و مەلول و سەرگەردانیمە
دیسان وەک جاران شین و زاریمە
خەمو پەژارەی دەردە داریمە
دیسان چەرخەکەی چەواشەی بەدخوو
بۆ ئازاری دڵ کەوتە هاتو چوو
دیسان قرچەی زام دەروونی ڕێشم
زوخاو ڕێژ ئەکا جەرگی پڕ ئێشم
گەردوون هەرتاوێ جەورێ ئەنوێنێ
چەشنی بایە قوش بەزمێ ئەخوێنێ
گەردوون کردەوەی نامورادییە
دۆشت لەیەک کردن دڵ ناشادییە
گەرون بەدکاری بەینی دڵانە
گەردوون خەزانی باخچەی گوڵانە
گەردون هەر ڕۆژێ دوژمن ،پیاوێکە
زەهری کوشندەی خاوەن ناوێکە
حاجی تۆفیق بەگ،پیرەمێرد مەشوور
مامۆسایزانای کوردی خواروو ژور
کام پیر؟ئەو پیرە بە هۆشیاری
عومر رابوارد، بە فیدا کاری
کام پیر؟ئەو پیرەی بەژیان و ژین
گشت کوردستانی پڕکرد لە زانین
کام پیر؟ئە پیرەی هیمەتی نوان
بۆ کوردی نوسین، ئەوێ ڕچەی شکان
کام پیر ؟ئەوپیرەی پەندی پێشینیان
کرد بە مامۆستای بێگانەو خێشان



# قانع- بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە کتێبی کوردیدا

1969– 2010

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**

زۆرێک لە خوێنەران ئاگادارن، چەند ساڵێکە کار لە پڕۆژەیەکدا دەکەین و لەبەر چەند هۆکارێک، نەتوانراوە هەموو وردەکارییەکانی پڕۆژەکە تەواو بکەین، لەگەڵ ئەمەشدا، توانراوە چەند بەرهەمێکی لێ بڵاوبکەینەوە، بەتایبەت لە ژمارەکانی ڕۆڤاردا، هەندێ بیبلیۆگرافیای تایبەتمان ئامادە کردووە... ئەمە جگە لە چەند بیبلیۆگرافیایەکی تر، کە وەک سیپارە (نامیلکە) یان پاشکۆ، بڵاوبوونەتەوە.
بەپێی توانا، زۆرترین وردەکاریمان لەگەڵ ئەم پرۆژەیەدا کردووە و زۆریش پێوەی ماندوو بووین، بێ هیچ گومان و چەندوچوونێک، هێشتا کەموکورتی هەیە، کە ئەمەش سروشتێکی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیایە، بەتایبەت لە وڵاتێکی وەک کوردستان و لەپێناوی کتێبی کوردیدا.
ئەم پڕۆژەیە، جگە لە کتێب بە زمانی کوردی –لە سەرەتاوە تاکو ساڵی –2010، کتێبی نووسراوی

به هیچ زمانێکی دیکە لەخۆ نەگرتووە، هەروەها، گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنیا ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەک "کتێب"، دووبارە چاپ کراونەتەوە، لەهەمان کاتدا، پرۆژەکە تەنیا ئەو کتێبانەی کۆکردووەتەوە کە لەبارەی "کورد و کوردستان" نووسراون.

لە بەرگی سێیەمدا کە تایبەتە بە "ئەدەبی کوردی"، چیرۆک و ڕۆمان و دیوانی هیچ شاعیرێکمان وەرنەگرتووە؟ لەکاتێکدا هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و نووسین و بابەت و وتارانە... تاد، وەرگیراون، کە پەیوەندییان بە: شیعر، ژیان، سەردەمی... شاعیرانی کوردەوە هەیە، چونکە کاتێک لێکۆڵینەوە لەبارەی شاعیر یان چیرۆکنووسێکی کوردەوە دەکرێ، تاڕادەیەک بەرهەمەکانیان دیارە و کارئاسانییەکە ئەمەیە کە ئایا چی و کێ و کەی و چۆن؟ لەبارەیانەوە نووسراوە...

هەندێک لە نووسەران و شاعیرانی کورد، وەک پێویست لایان لێ نەکراوەتەوە و لە کاتی ئامادەکردنی "بیبلیۆگرافیا" لەبارەیانەوە، هەست بە ناتەواوی دەکەیت، ئەمەش لە دەسەڵاتی "ئامادەکار"دا نییە. بۆ ئەم بیبلیۆگرافیایە، چەند بابەتێکی "قانع"مان داناوە، کە لە ژمارەکانی هەردوو گۆڤاری "ڕۆژی نوێ" و "هەتاو"دا، بڵاوی کردوونەتەوە و وەک کتێب ساڵی 2010 چاپکراون، واتە وەک سروشتێکی بیبلیۆگرافیاکە لە ساڵی 2010دا، دادەنرێن. هەروەها "قانع" لەگەڵ "کەریم زەند"دا، کتێبێکیان بە ناوی "مێژووی نەژاد و پەیوەستەگی کورد"ەوە وەرگێڕاوە، کە چاپی یەکەمی ساڵی 1969 و چاپی دووەمی لە ساڵی 2009 بووە.

لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پرۆژەکە، کتێبەکان بەپێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بەپێی (تیپ)ـە کوردییەکان ڕیزکراون. هەروەها بەپێچەوانەی بیبلیۆگرافیا سەرەکییەکە، ناونیشانی کتێبەکانیش بەپێی ڕێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە.

لەپێناوی زانیاریی زۆرتر لەبارەی پرۆژەکە و شێوازی بیبلیۆگرافیاکە، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە ژمارەکانی پێشتری ڕۆڤار، هەروەها: بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی- بەرگی یەکەم: مێژوو و جوگرافیا، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، چ (حاجی هاشم)، 2014.

هێما بەکارهاتووەکان

چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم

چ: چاپخانە

ش: شوێن

و- وەزارەت

ژس: ژمارەی سپاردن

س: ساڵ

ل: لاپەڕە

ق: قەوارە (بە سانتیمەترە و "پانی"ی پێش "درێژی"ی نووسراوە)

؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

کۆڕ: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی (عێراق و کورد)




یەکەم بیبلیۆگرافیا -1969 2010

یەکەم: بەرهەمەکانی قانع

1- مێژووی نەژاد و پەیوەستەگی کورد

نووسین: ڕەشید یاسەمی

بەرچڤەی بە دەستکارییەوە: قانعی هۆنەر و کەریم زەند

بە ڕەزامەندی (وزارة الثقافة والأعلام) چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: کامەران، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: 1969، ل:113، ق:17×23

ناوەڕۆک:

مێژووی کورد/ کوردستانی کۆن/ کۆنترین دانیشتوانی زاگرۆس/ گوتی/ سێیەمین زنجیرەی

پاشاهانی نوور/ کاسی/ تێکەڵی هیند و ئەوروپاییەکان لەگەڵ ئاشوور و ئیلام/ پەیوەندی ئاشوور و دانیشتوانی زاگرۆس/ کیمریان و ساکائیان/ کولەکەکانی ئاسار حادون و ئاشوور پانیپاڵ/ ماد و فارس/ فارسەکان/ هوخشتەر/ ئیختوی گو (ئەزدی هاک)/ کورشی گەورە/ کورد/ لێکۆڵینەوەی زاناکان لەبارەی وشەی کوردەوە/ ڕەگەزناسی/ ڕیشەی کورد/ ئایین و باوەڕ/ کورد پێش ئیسلام- کورد لە خولی سلوکی و ئەشکانیدا/ ڕەگەز و نەژادی ساسانی/ کۆتایی: لە نووسینی هەردوو وەرگێڕ.

2- شێخ مەحموود لە شیعری کوردیدا- بەرگی یەکەم

نووسین: لەتیف بەرزنجی

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیری و لاوان، ش: هەولێر، ژس:46، س: 1990، ل:112، ق:16×22

ناوەڕۆک:

کەس نەڵێ ئەم بێشە چۆڵە: قانع/ پێنج خشتەکی قانع لەسەر شیعرێکی حەمدی.

3- کورد- نەژاد و پەیوەستەگی- تۆماری تەمەن 10

نووسین: ڕەشید یاسەمی محەممەد وەلیخان

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: قانعی بلیمەت و کەریم زەند



چاپ: یەکەم، چ: ئەزمڕ، ش: سلێمانی، ژس: 1360، س: 2009، ل:310، ق:17×24

ناوەڕۆک:

هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە 1.

4- گۆڤاری ڕۆژی نوێ- ساڵی یەکەم (ژمارە 1-6) (نیسان- ئەیلوولی 1960)

ئامادەکردن: سدیق ساڵح و ڕەفیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: 1905، س: 2010، ل:686+20، ق:16×23

ناوەڕۆک:

ژمارە 5 ساڵی 1- ئافرەتانی کوردستان: قانع.

5- گۆڤاری ڕۆژی نوێ- ساڵی یەکەم (ژمارە 7-12) (تشرینی یەکەمی 1960- مارتی 1961)

ئامادەکردن: سدیق ساڵح و ڕەفیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: 1905، س: 2010، ل:691-1438، ق:16×23

ناوەڕۆک:

ژمارە11 ساڵی 1- تۆمار- لوڕ و لوڕستان: قانع.

ژمارە12 ساڵی 1- لوڕی بچوک: قانع.

6- گۆڤاری ڕۆژی نوێ- ساڵی دووەم (ژمارە 1-6) (مارت- ئەیلوول 1961)

ئامادەکردن: سدیق ساڵح و ڕەفیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: 1905، س: 2010، ل:57+2168-1443، ق:16×23

ناوەڕۆک:

ژمارە4 ساڵی 2- پاشایەتی شارەزوور- بەدر کوڕی حسێن: قانع.

ژمارە6 ساڵی 2- سەلیم پاشای بابان و شاری سنە: قانع.

7- گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی دووەم- بەشی یەکەم (ژمارە 31-47)

ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵڵا زەنگەنە

پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی

پڕۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س:

2010، ل:1146-735، ق:17×23
ناوەرۆک:
ژ44: بۆ کۆڤاری هەتاوی خۆشەویستمان: قانع.
ژ45: دینی کۆنی کورد: قانع.
ژ47: نامەیەکی کراوە بۆ هەموو نووسەران: قانع و مەحموودی حاجی ڕەحیم.

8- گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی چوارەم- بەشی دووەم (ژمارە 130-115)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵلا زەنگەنە
پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی
پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س: 2010، ل:51+3473-3015، ق:17×23
ناوەرۆک:
ژ115: نامەیەک بۆ هەموو نووسەرەکانی کوردستان: قانع.

9- گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی شەشەم- بەشی یەکەم (ژمارە 165-154)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵلا زەنگەنە
پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی
پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س: 2010، ل:4864-4407، ق:17×23
ناوەرۆک:
ژ161: سکاڵایەک: قانع و مەلا مارف شارەزووری.

10- گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی حەوتەم (ژمارە 188-177)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵلا زەنگەنە
پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی
پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س: 2010، ل:27+5856-5271، ق:17×23
ناوەرۆک:
ژ181: مەلا ئەبوبەکری چۆڕی: مامۆستا قانع.
ژ182: هەندێ لە کردەوەکانی سمکۆ: قانع.
ژ187: سنووری دەستکردی خوێنمژان: قانع.

دووەم: کتێبی سەربەخۆ لەبارەی قانع

هەندێ لای ئەودیوەکەی بیری قانع
نووسین: محەممەدی مەلا کەریم
چاپ: یەکەم، چ: دار الجاحظ، ش: بەغدا، ژس: 733، س: 1972، ل:32، ق:13×18
ناوەرۆک:
هیچ ناونیشانێکی تێدا نییە... بابەتەکانی نێو ئەم کتێبە، لە ژمارە 12 و 13ی ڕۆژنامەی (بیری نوێ) دەرهێنراوە، هەروەها کتێبەکە وەک (دیاری) دابەشکراوە.

یادی قانع- بیروڕای کۆمەڵێک ڕۆشنبیری کوردە بەرامبەر بە شاعیر و هەڵوێست و شیعرەکانی
ئامادەکردن: بورهان قانع
بە یارمەتی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: ئیرشاد، ش: بەغدا، ژس: 1618، س: 1978، ل:104، ق:17×24
ناوەرۆک:
وەکو هەواڵێک: بورهان قانع/ کورتەیەک لە ژیانی شاعیرەوە/ بەرنامەی کۆڕەکە/ تێبینییەکی کورت/ لەگەڵ یادەکەدا/ وتاری بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی: محەممەد ئەمین پێنجوێنی/ وتارێکی یەکێتیی نووسەرانی کورد:

ئەژی گۆران/ وتاری دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی: فریا عەبدوڵڵا/ وتاری مامۆستا شوکور مستەفا/ وتارەکەی محەممەدی مەلاکەریم/ شیعری قانع/ لەبارەی عیزەتی نەفسی خۆیشیەوە ئەم نموونەیەی ئەخەمەپێش چاو کە پارچە شیعرێکی موفتی مەلا عەبدوڵڵای پێنجوێنی پێ کردووە بە پێنج خشتەکی/ بەراوردکردنێک یان بیرورِاو پەیوەندییەکانی قانع لە رِوانگەی بیرکاری (ماتماتیک)ی نوێوە: مستەفا نەریمان/ قانعی بۆکرِوزو کەڵە پشکۆی شیعری میللیمان: کاکەی فەللاح/ کورتە باسێکی سەرزارەکی: کەریم زەند/ سوپاسی بنەماڵەی شاعیر لەگەڵ خوێندنەوەی وەسیەتنامەکەی شاعیر: بورهان قانع/ لە بیرەوەری شاعیرێکی ئازادا: لەتیف هەڵمەت/ وتاری ئیستگەی رِادیۆی کوردی لە بەغدا/ وتاری کۆمەڵەی رۆشنبیرانی کورد لە بەغدا/ دیوە چینایەتییەکەی هۆنراوەکانی قانع / زنجیرەی تێبینییەکان.

دووەم بیبلیۆگرافیا

بابەتی نووسراو لەبارەی (قانع)ەوە 1970- 2010



1. باخچەی شاعیران- بەسەرهات و هەڵبەستی 41 بویژی کورد

کۆکردنەوە و لەسەر نووسین: عەبدولعەزیم ماوەتی و عەبدولقادر ساڵح

چاپ: یەکەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: 1970، ل:163، ق:15×22

ناوەرۆک: قانع -1898 1965.

2. مێژووی وێژەی کوردی- نووسراوی 2

نووسین: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)

لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشاراتی (ناجی) لە بانە

چاپ: یەکەم، چ: چهر تبریز، ش: تەورێز، ژس: ؟، س: 1375 (1996)، ل:26+742، ق:17×24

ناوەرۆک:قانع.

3. چێشتی مجێور

نووسین: عەبدولرِەحمان شەرەفکەندی (هەژار)

ئامادەکردن و سەرپەرشتیاری چاپ: خانی شەرِەفکەندی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: پاریس، ژس:؟، س: 1997، ل:581، ق:15×21

ناوەرۆک: قانع/ دیسان باسی شێخ قانع.

4. ساڵنامەی کوردی 2699

ئامادەکردن: کازم کۆیی

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: هەولێر، ژس: 258، س: 1998، ل:32، ق:12×17

ناوەرۆک: ژیاننامەی هەریەک لەم شاعیرانە و نموونەیەک لە شیعرەکانیان: قانع.

5. نەمریی لە ئەدەبدا- ئاوێنەی ژیان و بەرهەمی کۆمەڵێک شاعیر

نووسین: ئۆرخانی غالیب

چاپ: دووەم، چ: ئازاد، ش: سلێمانی، ژس: 210، س: 1999، ل:208، ق:15×20

ناوەرۆک: قانع 1898 - 1965.

تێبینی: چاپی یەکەمی ئەم کتێبە، ساڵی 1988 لە وڵاتی سوید، بە کۆدی -973354-91 ISBN 0-6 چاپکراوە.

6. دەربارەی ئەدەب و مێژوو

نووسین: ئومێد ئاشنا

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و رووناکبیریی گەلاوێژ

چاپ: یەکەم، چ: داناز، ش: سلێمانی، ژس: 240، س: 2001، ل:353، ق:16×21

ناوەرۆک: چەند پارچە شیعرێکی لەیادکراوی

قانع/ ناوەرۆک.

7.	ڕۆژنامەی ژیان- ژمارە 81-1 – یەکەم بەرگ
ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح
لێکۆڵینەوە: سدیق ساڵح
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: 115، س: 2002، ل:428، ق:21×31
ناوەرۆک: ژیاننامە: قانع.

8.	یادکردنەوەی ئەستێرە گەشاوەکانی ئەدەب و هونەر
نووسین: مارف ناسراو
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژس: 139، س: 2002، ل:200، ق:17×24
ناوەرۆک:(قانع) 15ی ئەیلوولی -1898 7ی ئایاری 1965.

9.	بارزانی لە ویژدانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا- بەرگی یەکەم
نووسین: حەسەن دانیشفەڕ (هێور)
چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: 16، س: 2003، ل:272، ق:17×23
ناوەرۆک:کۆچی خێر: قانع.

10.	ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی- لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی
نووسین: عەزیز گەردی
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: دێکان، ش: سلێمانی، ژس: 208، س: 2003، ل:790، ق:17×23
ناوەرۆک:پێشەکی/ کارکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر

بەرهەمی 82 شاعیری کورد...: قانع.

11.	یاقووت و زمرووتی کوردیی- ئایین و فەلسەفە (بەرگی دووەم)
نووسین: حسێن محەممەد عەزیز
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: 651، س: 2004، ل:223، ق:15×20
ناوەرۆک: کۆمەڵێک شاعیری کورد: قانع.

12.	بۆتان ئەگێڕمەوە- زنجیرەی دووەم/ هەڵبژاردەیەک لە شیعر و یاداشتەکانی ع.بەسۆز
نووسین: ع.بەسۆز
ئامادەکردن: بەیاد عەبدولقادر
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری - بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم ، چ: ؟، ش: سلێمانی ، ژس: 568، س: 2005، ل:504، ق:16×23
ناوەرۆک: لەگەڵ هەرە بەناوبانگەکانی شیعری نوێی کوردی: قانع.../ هەڵبەست و هۆنراوەکانی.

13.	سەرجەمی بەرهەمی محەممەد ئەمین زەکی بەگ- یەکەم بەرگ
نووسین: محەممەد ئەمین زەکی بەگ
ئامادەکردن: سدیق ساڵح
لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: 146، س: 2005، ل:255، ق:16×22
ناوەرۆک: جوابی پرسیاری (قانع).

14.	گۆڤارا ڕۆناهی- ڤەکۆلینەک دیرۆکی، ڕەوشەنبیری دگەل ئینديكسێ نڤیسەرێن ڕۆناهی
نووسین: موسەدەق تۆڤی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیرێز



چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: 60، س: 2005، ل:121، ق:15×21

ناوەرۆک: ئیندێکسێ نڤیسەرێن ڕوناهی: قانع.

15. هێندێ بابەتی زمانەوانی و وێژەیی "ڕەخنە و کۆڵینەوە"

نووسین: حسێن محەممەد عەزیز

چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژس: 225، س: 2005، ل:297، ق:15×20

ناوەرۆک: بەشی دووەم: وێژە/ بیرە ڕوونەکەی (قانع).

تێبینی: هەروەها کۆدی -970560-91 :ISBN 6-5 وەرگرتووە.

16. کەشکۆڵ

نووسین: محەممەد عەبدولکەریم سۆڵەیی

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژس:245، س: 2006، ل:399، ق:17×24

ناوەرۆک: چل ساڵ دوای مەرگی قانع.

17. مێژووی ئەدەبی کوردی 1945 - 1975 بەشی شەشەم

نووسین: د.مارف خەزنەدار

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: 71، س: 2006، ل:633، ق:17×23

ناوەرۆک: بەشی بەشی بیست و شەشەم: قانع.



18. چێشتی مجێور

نووسین: عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی (هەژار)

ئامادەکردن و (نوویسیار): ماجید مەردۆخی ڕۆحانی

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی میهرەگان

چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: تاران، ژس: ؟، س: 2007، ل:562، ق:18×24

ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە بڕوانە کتێبی ژمارە 3.

19. لە میحرامی ئەدەبدا- چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی

نووسین: د.سەباح بەرزنجی

لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کۆمەڵ

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژس: 904، س: 2007، ل:82، ق:16×22

ناوەرۆک: ڕەنگدانەوەی کەلتووری ئایینی لە شیعرەکانی قانعدا.

20. یاداشتنامەی ژیانم

نووسین: جەمال بابان

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری - بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژس:1130، س: 2007، ل:396، ق:16×22

ناوەرۆک: ئەحمەد شوکری (د.شۆ) و قانع و من.

21. یاقووت و زمرووتی کوردیی (سروشت و جوانیی)- بەرگی سێیەم

نووسین: حسێن محەممەد عەزیز

چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژس: 433، س: 2007، ل:317، ق:14×20

ناوەرۆک: زستان- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: قانع/ بەهار- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: قانع/ هاوین- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: قانع.

تێبینی: جگە لە ژمارەی سپاردن، کۆدی :ISBN 1-8-970560-91وەرگرتووە.

22. ئەدەب – کۆمەڵە وتارێکی ئەدەبی
نووسین: د.ڕەفیق شوانی
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: 2708، س: 2008، ل:109، ق:16×23
ناوەرۆک: قانع – شاعیری بەرگریی چەوساوەکانی کوردستان.

23. مێژووی وێژەی کوردی- بەرگی دووەم
نووسین: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: 942، س: 2008، ل:840، ق:16×23
ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە بڕوانە کتێبی ژمارە 2.

24. هەژار و مرۆڤ و دەوروبەر یا کارەساتی کۆمیدیایەک- بەرگی یەکەم
نووسین: شێرکۆ هەژار
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: 2008، ل: 119- 211+4، ق:21×30
ناوەرۆک: چەند بابەتێکی وەک: هەوای قانعی دەزگێڕی کۆڵانگەڕ.

25. گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی دووەم- بەشی دووەم (ژمارە 61-48)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵڵا زەنگەنە
پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی
پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س: 2010، ل:34+1524-1151، ق:17×23
ناوەرۆک: ژ51: نامەیێک بۆ کاک قانع و هاوڕێکەی: نەریمان- کەرکووک/ ژ61: پرسیار لە مامۆستا قانع: گ.م.

26. گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی چوارەم- بەشی دووەم (ژمارە 130-115)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵڵا زەنگەنە
پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی
پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س: 2010، ل:51+3473-3015، ق:17×23
ناوەرۆک: ژ117: نرخی بوێژ و وێژە لە کوردستانی عێراقدا (قانع): ع.م.شارەزووری/ ژ118: وەرام بۆ مامۆستا قانع: ن.وەشتی.

27. گۆڤاری هەتاو 1954- 1960/ بەرگی حەوتەم (ژمارە 188-177)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵڵا زەنگەنە
پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی
پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: 577، س: 2010، ل:27+5856-5271، ق:17×23
ناوەرۆک: ژ183: قانع و کورد.

28. مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی شەشەم 1945- 1975A
نووسین: د.مارف خەزنەدار
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: 374، س: 2010، ل:672، ق:15×21






ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە بڕوانە کتێبی ژمارە 16.

29. هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا- بەرگی دووەم شاعیران

نووسین: حەکیم مەلا ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی یادگاریی هەڵەبجە

چاپ: یەکەم، چ: دیلان، ش: سلێمانی، ژس: 1793، س: 2010، ل:280، ق:17×24

ناوەرۆک: قانع.

Bwar_n@yahoo.com





## مەریوانم

مەریوانە مەکانی مەهرو خانە
مەریوانە وەکو باخی جینانە
مەریوانە بەهەشتی ڕووی زەمینە
مەریوانە کە نایابی جیهانە
برا ، سەرچەشمەکەی وەک سەلسەبیلە
بە عەینی خاکەکەی فەردی زەمانە
لە ناو ئەو دەشتەدا، گۆلی زریبار
نموونەی چاوی لەیلی عاشقانە
هەوایێ موعتەدل، کویستانێ پڕ گوڵ
بە مڵ باقی وڵاتا ، ئـــــاسمـــــانە ...
بەهەشتە ئاوو خاک و باوو ئەرزی
کچانی حورو کوڕ غیلمانیانە
ئەمە زۆر فەخرە بۆ خاکی مەریوان
موئەریخان ئەڵێن: جێی ئەردەڵانە
ئەمیر حەمزەو هەڵۆ خان و قوباد بەگ
یەکا یەک جێگە دەستیان تیا نیشانە
جەنابی ناری فەرمووی خاکی ئێمەیە
قەدیم تا ئێستا جێگای شاعیرانە
خەیاڵی و شێخ سەعید و خاتو خۆرشید
مەلا ئابی کە شیعری چەند جوانە
فەریق و ناری هەردوو بەحری عیلمن
لە گەشت لایە هونەر هایان عەیانە
بە فارسی و عارەبی کوردی وە تورکی
بە چوار زوانە ، ئەدەبیاتیان بەیانە
لە قەڕنی پێشوو وا کاری مەریوان
موحەق خارجی شەرح و بەیانە
زمان کوا قوەتی شەرحی ئەدا کا ؟
قەڵەم کەی قابلی ئەو داستانە ؟
بە هیچ "قانع" هەموو وەسف و سەناکەت
کە ئێستا مەنزڵی بێگانەکانە .



# قانع مرۆڤێک، یەک هەڵوێست .. شاعیرێک هەمەڕەنگ

**دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن**

شاعیر پێش ئەوەی شاعیر بێت، مرۆڤە. مرۆڤ تاکێکی نێو کۆمەڵگایە و کۆمەڵگاش، لە ڕووی مرۆییەوە لە خێزان و بنەماڵە، هۆزو نەتەوە پێک دێت. لە ڕووی ئایینیەوە لە ئاین و ئاینزاوە پێک دێت، لە ڕووی چینایەتی لە هەژار و دەوڵەمەندەوە پێک دێت. لە ڕووی دەسەڵاتەوە – بەتایبەت سەردەمی ژیانی قانع – کۆمەڵگای کوردەواری لە ئاغاو شێخ و مەلاو مسکێن پێکهاتبوو. لە ڕووی خاک و جوگرافیاوە، گوندو شارەدێ و شارو وڵات بوو. بۆ قانع، وڵاتەکەی پارچەپارچەکراو و داگیرکراو بوو، لە ڕووی ئایدۆلۆژیاوە، گەڕی ئاین و نەتەوەو چین و نێونەتەوەیی گەرم بوو، سەرباری هەموو ئەمانەش لە ڕووی جەستەییەوە، قانع هەروەک هەژارییەکەی، نەخۆشیەکی بۆ بەمیرات مابووەوە، لە ڕووی هۆشیاری و ڕۆشنبیرییەوە، قانع لە حوجرەی مزگەوت و لە دەرزی ئاینی – بەتایبەت ئیسلامی – و



ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی و کوردی، چاویان کردبووەوەو دواجاریش هەواڵ و ڕۆژنامە و بڵاو کراوەو کتێبە سیاسییەکان، ڕۆشنبیریی قانعیان زاخاو دەدا. لەگەڵ ئەمانەشدا کەسایەتی قانع خۆی، کە کەسایەتیەکی ئازاو ئازاد و هەژارو بێکەس بوو، لەنێو ئەم هەموو ساردی و گەرمییەدا لەنێو کورەی ڕۆژهەڵاتدا، قانع دەژیا و دەسوتا و کاری دەکرد و خەباتی دەکردو شیعری دەنووسی.

ئەم دەوروبەرەی کە بە کورتی و بە پەلە بە نێویدا گوزەرمان کرد، کاریگەری بەردەوام و ڕاستەوخۆیان لەسەر جەستەو باوەڕو ژیان و خەباتی قانعدا هەبوو، هەموو ئەمانەو زۆر بابەتی تر لەنێو دیوانە دەوڵەمەندە ناتەواوەکەی قانعدا بەرچاون. هەر بۆیە ناکرێ باسی شیعری قانع بکەین و زمان و هونەر و جوانییەکانی شیعرەکانی باس بکەین و نەزانین قانعی شاعیر وەک مرۆڤ چۆن ژیاوە و چی خواردووە چی لەبەر کردووەو لەکوێ و لەنێو چ جۆرە خانوو نوێنێکدا خەوتووە؟! هێمن، شاعیری گەورەی موکریان، لە پێشەکی دیوانی تاریک و ڕوون-دا باس لە خووێکی جوانی خۆی دەکات، کە دەتوانم بڵێم، خوی زۆربەمانە؛ لە سەرەتای پێشەکیەکەیدا ئاوا دەست پێدەکات و دەنووسێ: "من بۆ خۆم وام، ڕەنگە زۆر کەسیش وا بێت، کە شیعری شاعیرێک یا نووسراوی نووسەرێک دەخوێنمەوە "چ زیندوو چ مردوو" پێم خۆشە خۆشی بناسم بزانم کێیە؟ خەڵکی کام وڵاتە؟ کاری چییە؟ چۆن دەژی و ئەگەر مردووە چۆن مردووە؟ لە کوێ نێژراوە؟.

ئەم وابوونەی مامۆستا هێمن وابوونێکی لەجێیە و ئەم لەجێبوونەش، لە هەر کەس و هەر شاعیرێک زیاتر بۆ قانعی شاعیرو مرۆڤ و کورد ڕەوایە. چونکە هەموو ئەم پرسیارانەو زۆری تریش وەڵامەکانیان لەنێو دیوانەکەی قانعدا دیارو بەرچاوە، هەریەکەیان – یەکەکانی دەوروبەر– لە کات و شوێن و باری خۆیاندا کاریگەر و بەرهەمهێنەری شیعرەکانی قانعن، هەر ئەمەشە وای کردووە، قانع لەبەرهەمهێنانی شیعردا، لە هەموو ژیانی و لە هەموو قۆناغە -جیاجیاکانی– ژیان و شیعریدا شاعیرێکی هەمەڕەنگ بێت، هەمەڕەنگ لە ڕووی بابەت و ئایدۆلۆژیاو هونەرەکانی شیعرەوە. لە ڕووی ئایدۆلوژیاوە سەیر دەکەین، قانع لە سەرەتاوە زیاتر لە هەر شتێک لەژێر کاریگەری بیری ئاینیدا بووە، ئەمەش کارێکی سەیر نییە! قانع کەباب و باپیری پیشەیان مەلایەتی بووبێ و خۆشی لە حوجرەی مەلایەتی فێری – خوێندەواری بووبێ و چاو و ڕۆشنبیریشی هەر لەو نێوەندە گەش و تیژبینتر بووبێت، ئاساییە لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانیدا بکەوێتە ژێر کاریگەری گەرمی ئایینەوە، هەر بۆیە لە سەرەتاوە بەم شێوەیە، ئەم هەستەی خۆی دەردەبڕێ، دەنووسێ:

یا محەممەد لێو بەبارو دڵ بە بوریانم مەکە
ئەی ڕەئیسی هەردوو دنیا دیدە گریانم مەکە
دەستەو ئەژنۆ و چاوە ڕێگەی دەستی یارانم مەکە
غەیر قاپی ڕەفئەتت، بۆ کەس سەناخوانم مەکە

لێرەدا قانع تەواو وەک کەسێکی باوەڕ بەئاین – بەتایبەتی ئاینی ئیسلام – بیر دەکاتەوەو دەپاڕێتەوە و هەموو خواست، هیوای خۆی لە کەسایەتی – محەممەد – پێغەمبەری ئیسلام داوا دەکات و هیچ هێمایەک لێرە، لەم شیعرەدا بەرچاو ناکەوێ کە قانع پشت بە خۆی ببەستێ و بڕوای بە تواناو کارکردنی خۆی هەبێت! بۆیە دەتوانین بڵێین: قانع لێرە کەسێکی موسوڵمانی نێو کۆمەڵگایەکی موسڵمانە و لە کۆمەڵگا جیا نەبووەتەوە و ڕەنگی گشتی ئەو کۆمەڵگایەی وەرگرتووە و قانعێکی وەک هەمووانەو ڕەنگی هەمووانی وەرگرتووەو هێشتا دیدی ڕەخنەیی، بەتایبەت ڕەخنە لە کۆمەڵگایەکی ئاینی دواکەوتووی نەکراوەتەوەو قەڵەمی ڕەخنەگرانەی نەخستووتە کار.

قانع کە کەسێکی وشیارو وردبین و جوڵاو بووە، دواجار تاسەر بەم شێوەیە نامێنێتەوە و هەڵسوکەوتی خەڵک و ژیانی خەڵکەکە بۆی

دەردەخەن، کە خەڵکەکە خراپ لە ژیان و لە ئایین گەیشتوون بەجۆرێک خۆیان داوەتە دەست ئاین و هەڵسوکەوتێک دەکەن کە بۆ ژیان بەکەڵک نایەت. ڕوو لەوانە دەکات کە دەیانەوێ بە ڕووکار و ڕیشەوە دنیاو دین بخۆن، قانع لە شیعرێکدا دەنووسێ:

پرچ و بەرماڵ و سیواک و ڕیش کەشکۆڵ و عەبا
بۆ سواڵن کەی ئەمە ئەسبابی ژین و حورمەتە

لە ڕۆژگاری قانع و پێش ئەو و تا دەگاتە ئەمڕۆش لە کوردەواریدا کەسانێک هەن، لە ژیانیاندا، دارێک ناخەنە سەر بەردێک و بە دوعا و پاڕانەوە قسە دەکەن و بە نانی کەسانی تر دەژین، کە لای قانع ئەم ژیانە، نان پەیداکردن تێیدا لە پەنای بەرماڵ و سیواک و ڕیش و کەشکۆڵ عەبا، ژیانی کەسێکی شیاو بەحورمەت نییە! ئەمانە و زۆری تر، کە لەنێو کۆمەڵگای کوردەواریدا نابنە هۆی گۆڕان و پێشکەوتنی ژیان، قانع بەرەو ئەوە دەبات کە خۆی لە جۆری ژیانی باب و باپیری داببڕێت و بنووسێت:

مەلایی و خوێندەواری خوو ڕەوشتی خۆم و باوانمە

بەڵام، من ئارەزووی نان و ژیانی وەک مەلا ناکەم ژیانی مەلا لە کوردەواری، لەسەر زەکات و سەرفیترەو خێرو سەدەقەی خەڵک بوو، ئەم ژیانەش لە مەلایەتییە، قانع مەلایەتیکردن پیشەی باوانیەتی و پێیەوە ناسراون، بەڵام، قانع حەز بەم ژیانە ناکات و ئاشەوانی لا پیرۆز ترە، چونکە جگە لەوە بۆ رزق و ڕۆزی، دەبێت چاوی لە دەستی خەڵک بێت. لە قسەو ئامۆژگاریی ڕاست و ڕەوانیش کەس گوێی لێ ناگرێ و بەقسەی ناکەن، با قسەکان جوان و ڕاست بن و لە بەرژەوەندی خەڵکەکەش بووبن. دەنووسێ:

دە چی بکەم کەس بە گوێم ناکا، کە ئاغا نیم و مسکێنم. بەڵێ، خەڵک بە گوێی ئاغا و دەسەڵاتدار دەکەن، ئەگەر قسەکان ڕاستیش نەبن و لە قازانجیشیان نەبێ! بەڵام، بە گوێی قانعی مسکێن ناکەن، هەرچەندە قسەکانی ڕاستە و سوودی لێ دەبینن تا دواجار دەگاتە ئەوەی بڵێ:

قانعا، بێ سوودە، یاشێخ دوژمنی پێشکەوتنە.

کەواتە نە شێخ خۆی و نە لێ دەگەڕێ خەڵکەکە گوێ لە قسەی قانع ڕابگرن، هەرچەندە قسەکانی دەبنە هۆی پێشکەوتن و ژیانێکی خۆشتر! ئەوە شێخە حەز لە گۆڕران و پێشکەوتن ناکات و خەڵکەکەش لە دەمی ڕادەمێنن! نەک مسکێنێکی وەک قانع مرۆڤێکە بە دوای ڕاستی و دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا دەگەڕێ، ڕۆژێ ئەو ڕاستی و دادپەروەرییە لە سایەی ئاییندا دەبینێ و ڕۆژێ لە خەباتی چینایەتی و لە سایەی سێبەری سۆسیالستیدا و ڕۆژێک لە خەباتی نەتەوەییداو جارێکیش لە سایەی پێسکەوتن و زانستدا. هەربۆیە لە هەر سەردەمێکدا بڕوای بە یەکێک لەو بیرو ئایدۆلۆژیایانە هەیەو زۆر بە جدی کاری بۆ دەکات و لە شیعرەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە.

پاش ئەوەی تێدەگا ئەم تێگەیشتنە لە ئاین و هەڵسوکەوتی ڕووکەش و خراپ بەکارهێنانی ئاین لەنێو کۆمەڵگای کوردەواریدا، نابێتە هۆی گۆڕانکاری و پێشکەوتن و خۆشترکردنی ژیانی تاک و کۆمەڵ، ڕوو لە هەوای ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە دەکات، کە لە وڵاتی سۆڤیەتی ئەو سەردەمەوە دێ و ڕاگەیاندنەکان بە گەرمیەوە باسی دەکەن. لە وڵاتیش خەڵکێکی زۆر بەرە و ڕووی ئەو هەواو باوەڕەوە دەچن و هیوای زۆر و مەزنی لەسەر هەڵدەچنن. وەک بورهان قانع-ی کوڕی شاعیر لە پێشکەکییەکەیدا باس دەکات، "سەرکەوتنی شۆڕشە مەزنەکەی ئۆکتۆبەرو باوەڕی پێشکەوتنخوازی و دژایەتی فاشیزم زەمینەیەکی نیشتمانپەروەرانەو نەتەوایەتیانەیان خوڵقاندبوو".

بەڵێ، ئەم سەرکەوتن و زەمینەخوڵقاندنەی



باوەڕی سوشیالیستی، قانعی شاعیری هێنابووە سەر ئەوەی کە ڕزگاریی میللەت و سەرکەوتنی گەل هەر تەنیا لەو ڕێگایەداو ڕوو لە کورد دەکات و دەنووسێ:

کوردە وەرە بنوارە دەوای دەردت لە کوێیە
هەر پەیڕەوی لینین-ە دەواو چاری نەخۆشین

لەم بانگکردنەی میللەت و بەکارهێنانی وشەی "هەر"، ئەوە لە بیری شاعیر هەڵدەوێنجرێ، کە پەیڕەوی لە لینین، تاکە ڕێگایە بۆ دەرمانکردنی هەموو دەردەکان. ئەگەر ڕۆژێ بە ئیمانەوە لە پێغەمبەر دەپاڕایەوە، ئەمڕۆ بە باوەڕەوە ڕوو لەو ئاگرە سوورە دەکات و ئامادەیە سەرو ماڵی خۆی لە پێناویدا دابنێ، دەنووسێ:

ماڵ و سەرو ڕوحم بە فیدای ئاگری سوورە
ئەو ئاگرە پڕ جۆشە ئەکا ڕەجمی شەیاتین

شاعیر ئومێدێکی زۆری بەو ئاگرە سوورە هەبووەو ئامادە بووە سەرو ماڵی خۆی بۆ بکاتە قوربانی، چونکە لەسەر ئەو قەناعەتە بووە. ئەو ئاگرە - باوەڕە - بزوتنەوەیە. دەتوانێ – شەیتانە - دەسەڵاتدارەکان لەناو ببات، لەوەشدا شاعیر بەهۆی ئەو پێشینە و ڕۆشنبیرییە ئاینیەی کە هەی بووە، وێنە و دەربڕینی ئاینی لە زمانی شیعرە ئایدولۆژیایەکەیدا بەکارهێناوە، ئەوە زیاتر لەو باوەڕەمان نزیک دەکاتەوە، کە ئەگەر قانع پێشتر ئومێدێکی بەو بزووتنەوە ئاینیانە هەبووبێت کە خەڵکانێک دەوڵەتانێک لەژێر ئەو ناوەوە خەڵک و میللەتە ژێر دەستەکانیان هەڵدەخەڵەتاند، ئەوا ئێستا ئەم ئاگرە سوورە جێگای گرتووەتەوە و دەبێ میللەتی کورد و چینی کرێکار لەم ڕێگایەوە و لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئاگرەوە تێبکۆشن. ئەگەر لە شیعرەکەی پێشتریدا ڕووی لە کورد دەکردو دەرمانی دەردەکەی لە پەیرەوی لینین دا دەبینی، ئێستاش ڕوو لە چینی کرێکار دەکات و داوایان لێ دەکات لە ژێر ئالای ئەو بزوتنەوەیە یەک بگرن و خەبات بکەن، دەنووسێ:

یەک گرن ئەی چینی جوتیار یەک گرن
یەکگرن ڕۆڵەی کرێکار یەک گرن

قانع لە پشتبەستن بەم پەیڕەوی ئاگرە سوورەدا، زۆر بە هیواو ڕاستگۆ بووە، لە کارو گوفتاری خۆی، ئەو ڕۆژگارە ئەمە قەناعەتی بووە، قەناعەتی قانعیش لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی چینی هەژارو جوتیار و میللەتی بەشخوراو بووە، نەک بەرژەوەندی کەسی و کاتی. هەر بۆیە قانع لە ژێر کاریگەریی هەر بیروباوەڕێکدا خەباتی کردبێت، ڕاستگۆ بووە لەگەڵ خۆی و خەڵکەکە. وەختێکیش، بەگوێرەی ڕۆژگار و تێگەیشتنی خۆی، ڕێگا و باوەڕێکی لەبارتری دیوە، بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا وەری گرتووەو ڕەخنەی لەوەی پێشتر گرتووە، قانع لەم گەڕان و ڕاگۆڕینەدا بە دوای ڕاستییەک و یاسایەکدا گەڕاوە، کە بەرژەوەندی چینی بەشخوراوو میللەتی مافخوراوی تێدابێ، واتە قانع کەسێکی داخراو و وەستاو نەبووە، بەڵکە کەسێکی کراوە و جوڵاو بووە. هەردەم بە دوای بەرژەوەندیی گشتیەوە بووەو لەم ڕێگایەشدا ئازاری زۆری دیوەو برسێتیی زۆری کێشاوە و دەربەدەری و بەندیخانەی تاقی کردووتەوە. هەموو ئەم گەڕان و گۆڕانەشی بە قەناعەتی خۆی بە ئازادی کەسی خۆی کردووەو هیچ ڕۆژێک و جارێک، نەکەوتووتە ژێر کاری ترس و تەماع. قانع لەو سەردەمەدا بڕوای بە یەکسانی چینەکان هەبووەو کۆشاوە میللەتی لە دەردی چین چینەکان ڕزگار ببێ و جیاوازی نەبێت و لە نێوان ئاغاو مسکێندا ڕسوومی عەشیرەتی نەمێنێ، دەنووسێ:

بی نێنە گۆڕی تارەوە ڕسوومی عەشرەتی
فەرقی مەخەن لە بەینی غەنیدا هەتا مزوور

پێشترو لەناونیشانی ئەم وتارەدا، باسی ئەوەمان کرد، کە قانع یەک هەڵوێست و شیعر هەمەڕەنگ بووە، لە یەک هەڵوێستیدا، مەبەستمان ئەوەیە، کە قانع بەردەوام بە دوای مافی تاک و چینی کرێکارو جووتیارو میللەتی بەشخوراوەوە بووە، ڕزگاری ئەمانەی لە هەر خەبات و باوەڕێکدا دیبێت، قەناعەتی



پێ هێناوەو لە نێویدا تێکۆشاوە. واتە قانع باوەڕ گۆڕییەکانی لەپێناو ئامانجەکانی کردووە، ئامانجی قانعیش هەمیشە ماف و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵانی خەڵک بووە. لەپێناو ئەو ئامانجە نەگۆڕە قانع بەردەوام ڕێگاو ئامرازەکانی خۆی گۆڕیوە، ئەم ڕێگاو ئامراز گۆڕینەش چالاکییەکی بەردەوام و زیندوویەتییەکی گەرمی بە شاعیر داوە، کە بەردەوام لە مەیدانی خەبات و تێکۆشاندا بێت، جا ڕۆژێ ئاشەوان بووبێ یان لە سێبەری کۆماری کوردستاندا بووبێ!

قانع کە ڕۆژگار ڕووی باشی پێ نداوە هەر لە زووەوە، واتە لە منداڵیەوە، پێشهات گۆڕانکارییەکان شاعیر بێکەس و بێ-ماڵ دەکەن، دوای ئەوەی دەرەبەگەکانی ناوچەی مەریوان باوکی ئەم شاعیرەیان ئاوارە کردو موڵک و ماڵیان داگیر کرد، هەژاری و دەربەدەریەکی زۆری بینی و زۆر کاری جۆراو جۆری کرد بۆ ئەوەی نانی ژیانێکی مەمرەو مەژی پەیدا بکات و ئەم کارانەش سەر بە ئاشەوانیدا دەکات. بەڵام، نەفسی بەرزو باوەڕی قایمی قانع بە خۆی، ئەم ئاشەوانیە بە کەم نازانێ و شانازی پێوە دەکات، دەنووسێ:

لە تۆزی ئاشەدا غەرقم لە تەوقی سەر هەتا ئەژنۆم

بەڵام چەند خۆشە ئەو تۆزە، کە هەر خۆم ئامێرم بۆ خۆم



شاعیر بە کردەوە ئاشەوانی کردووە، لەگەڵ هەموو ئەو ناخۆشیەی کە لەئاشەوانیدا هەیەو کارێکیش نەبووە شیاوی لێهاتوویی ئەو شاعیرە بێت، بەڵام، قانع بۆیە ئاشەوانی کردووە، چونکە ئازادی خۆی وەکو کەس، لەو کات و شوێنەدا — لەو ئاشەوانیەدا بینیوە. ئەمەش بۆ خۆی ئەو قوربانیەیە کە لەپێناو ئازادیدا دەدرێ، ئەگەر ڕۆژێ سەرومالی لەپێناو ئاگری سوورد دادەنا، ئەوا ئێستا شانازی بە ئاشەوانیەوە دەکات لەپێناو ئەو ئازادییە، ڕۆژێکیش بۆی دەچێتە بەندیخانە.

بە وردبونەوە لە ژیانی قانع دەگەینە ئەوەی کە بڵێین، قانع لە سەرەتای ژیانیەوە، هەر لە منداڵییەوە لەنێو ناکۆکیەکانی کۆمەڵگاو گۆڕانکارییە سیاسیەکان و ململانێیە دەروونی و نەفسی و جەستەییەکاندا بووە. ناکۆکیی بنەماڵەو بەگەکان و ناکۆکیی هەژار و دەرەبەگەکان و ناکۆکیی ڕۆشنبیرو مەلاو شێخ و بەگەکان سەرباری ناکۆکییەکانی نێوان هێزو حکومەتەکان. ئەمانە هەمووی یەخەی قانعی هوشیارو تێکۆشەرو شاعیر و هەژار و بێکەسیان گرتووەو شاعیر بەو جەستە نەخۆش و لاوازەوە، بەو هەژاری و بێ پشت و پەناییەوە، ملی لەبەر ملی هەمووان ناوەو لە هیچ کەس و لایەنیکی نەخواردووتەوە و لە کاتی پێویستدا هەڵوێستی خۆی نواندووەو قسەی خۆی کردووە.

لە هەژاریدا قانع ئەو وەسفکردنەی مەدهۆش-ی زۆر چاک لێ دی کە دەنووسێ: "گڕی تێ بەر بدەیت بۆنسۆی لێ نایەت". ئەم هەژاری و بێ بەرگییە، بە وێنەکانی قانعەوە دیارە و هەژاریان لێ دەچۆڕێتەوە. دیارە ئەم هەژارییە، نابێ ماڵێکی پۆشتەو پەراخی بە دواوە بێت و سەر سفرەو خواردنێکی گەرم و شیاویشی هەبووبێ.

لەمەشدا قانع بەو ورەی بەرزو نەفسیەت بەرزییەوە پێی شەرم نەبووە، باسی ڕاستی و واقعیی ژیانی خۆی بکات و سکی بەتاڵ و ڕووتی و بێ بەرگی خۆی نەشاردووەتەوە، چونکە شاعیر جەوهەری مرۆڤی لە جۆری خواردن و بەرگی نایاب و پلەو پایەدا نەدیوە، ئەو ئازادیی خۆی لەکاری ئاشەوانیدا و لەپێناو لوقمەنانێکی سەربەرزانە و ئازادی نێو بەندیخانەدا دیوە، ئازادیەک لەپێناو گەل و نشتیماندا بێ. لەم بارەوە دەنووسێ:

زەوقی دڵ مەئلوفی تاڵە، هێندە تاڵی چەشتووە

نابینی لەززەت لە شەهدی وەسڵ، یاخود شەککەرا

لێرەدا شاعیر تەنیا باسی ئەوە ناکات کە تاڵی چەشتووەو تاریکی دیوە! بەڵکە ئەم تاڵی چەشتن و تاریکی بینینە زۆرە و لێناگەڕێ لە داهاتووشدا خۆشی ببینێ و شیرینی بچێژێ، چونکە زۆری و دوور و درێژی ئەم تاڵی چەشتنە لای بووە بە خوو تازە تام لە خۆشییەکانی پێگەیشتن و بەدەستهێنان ناکات، چونکە زەوق و نەفس و جەستەی لە تاڵی چەشتن و ناخۆشی بینین ڕاهاتووە. ئەم ڕاهاتنەش لەنێوان غاردانو هەڵاتن-دا بووە، غاردان بەدوای ناندا و هەڵاتن لەدەست دوژمن! ئەو غاردان و هەڵاتنەش بەردەوام بووە، نە نان ئەوەندەی زیاد کردووە، تا قانع دانیشێ و چیتر بە دوایدا غار نەدا، نە دوژمنیش کەمیان کردووە، تا لە دەستیان هەڵنەیەت، واتە قانع لە نێوان ئەم کەمی نان و زۆری دوژمنەدا هەڵاتووەو غاری داوە، قانع دەنووسێ:

لاقەکانم هەڵگری لاشەی زەبوون و پرخەمم
یا بەشوێن نانا ئەڕۆیی، یا لەدەس دوژمن فیرار

یەک هەڵوێستی قانع لە ژیاندا، لە ڕاستگۆیی شیعرەکانیدا بەدەردەکەوێ، واتە قانع چۆن ژیاوەو چۆنی بیرکردوەتەوە ئاوای نووسیوە، جوانییەکانی شیعری خۆی لە گوتنی ڕاستی و باسکردنی واقیعیدا دیوە. قانع لەگەڵ ئەوەی کە شیعری زۆر جوان و هونەری هەیە، بەڵام ئەوەندەی بەدوای ڕاستی گوتن و پێویستی گوتندا گەڕاوە، هێندە بیری لە هونەر و ستاتیکای شیعری نەکردووەتەوە، لێرەدایە دەبێ، ڕێز لەو چۆن ژیانەی شاعیر بگرین، کە ژیانێکە شاعیر بە باوەڕەوە هەڵی بژاردووەو بە پشوو درێژییەوە پاراستوویەتی، لە کاتێکدا دەیتوانی بە جۆرێکی تر بژی و ژیانێکی تری هەبێت.

شاعیر ئەم ژیانەی لە پێناو خاک و میللەت هەڵبژاردووە و ئامادەش بووە، هەتا لە ژیاندا ماوە هەوڵی بۆ بدات، لەم ڕووەوە دەنووسێ:

هەتا ماوم ئەبێ بۆ عیزەتی ئەم خاکە دەعوا کەم
خەڵاتی دوژمن و خەرقەی خیانەت قەت لەبەر ناکەم

بەم "قەت" گوتنە، قانع پێمان دەڵێ: من پەیمانم لەگەڵ خاک و میللەتەکەم داوە، هەتا ماوم هەوڵی بۆ دەدەم و ئەگەرچی ڕووت و بێ بەرگیشم، بەڵام، خەرقەی خیانەت لەبەرناکەم و بەرگی ڕووتی و ئازادی هەڵدەبژێرم.

قانع لە گەڕان و گۆڕاندا، لە پێناو خاک و نیشتماندا، کە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئاڵای کوردستان هەڵدەگرێ، بە گەرمی و بە زوویی ڕوو دەکاتە کۆمار و دەچێتە نێو تێکۆشەر و خزمەتکارانی ئەم کۆمارە و دەنووسێت:

سەد شوکر وا نەمردم، تا کە دیم ئاڵای کورد
کەوتە چاوم بە بەرزی، سوورەت و سیمای کورد
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

قانع وەک ڕۆشنبیرێکی هۆشیار و کوردێکی دڵسۆز لەهەر کوێ کەموکورتیی دیبێت، باسی کردووەو لەهەر کوێ شتێکی بە پێویست زانیبێت، گوتوویەتی. لەبارەی ئابووری و بەرهەمی خۆوڵاتی، زۆری نووسیوە:

مەنعی بکەن کەلوپەلی بێگانە بۆ وڵات
تا، پیشەسازی وڵاتت، بەهێز بێت و دەرکەوێ

شاعیر لەوە تێگەییوە، کە وڵاتی پێشکەوتوو، بەهۆی پێشکەوتنی بەرهەمی پیشەسازی و خۆماڵییە، هەر بۆیە داوا دەکات، کەلوپەلی بێگانە نەهێنرێتە نێو وڵات و گرنگی بە بەرهەمی خۆماڵی بدرێ، بۆ ئەوەی کارگە و پیشەسازیی وڵات پێش بکەوێ و بگەشێتەوەو دەرکەوێ، دەرکەوێ و بناسرێ. چونکە ئابووریی سەربەخۆ میللەتی سەربەخۆی دەوێ.

شیعرەکانی قانع ئەوانەی کە ماون و چاپ کراون، چونکە دەرکەوتووە، هەندێک لە شیعرەکانی سووتاون و فەوتاون، لەگەڵ ئەوەشدا، شیعرە بەردەستەکانی قانع بەرهەمی چاکن بۆ ناسینی قانع لە ڕووی دەروونییەوەو ناسینی کۆمەڵگای کوردەواری لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە. واتە قانع ژیان و شیعرەکانی بەڵگەی چاک و بەردەستن، بۆ ناسین و لێکۆڵینەوەی ئەم وڵات و ئەو سەردەمە.

واتە قانع ئەوەندەی کاری لە نێو کۆمەڵگا و لەسەر کۆمەڵگا کردووە، هێندە کاری لەسەر بیرو خەیاڵ، نەکردووە، بەڵکە ئەوەندەی توانیویەتی بیرو خەیاڵی لە خزمەت کۆمەڵگادا بەکارهێناوە. ئەوەش جارێکی تر زانین و ناسینی ژیانی شاعیرمان بۆ گرنگ دەکات و دەرگای ناسینی کەسێتیی ئەو شاعیرەمان بۆ دەخاتە سەرپشت. قانع لە بابەت و ناوەرۆکی شیعریدا زۆر دەوڵەمەندە، باسی هەموو ورد و بارێکی نێو کۆمەڵگا و ژیانی ئەو سەردەمەی کوردەواریی کردووە. ئەگەر هەموو گۆشە باسکراوەکان بەسەر بکەینەوە، کات و هەوڵی زۆرترمان دەوێ.

بۆ زمان و هونەرو ستاتیکای شیعریش، قانع هەمەڕەنگییەکی زۆر دەوڵەمەندی هەیە، کە ئەمە بۆ خۆی بابەتی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی زۆرترە. من لێرە لە کۆتایی ئەم نووسینەدا دەچمە نێو بەندیخانە و هەڵوەستەیەک لە تەک ئەو شیعرەدا دەکەم.

لەبەندیخانە

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە
زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرزرەی زنجیر ئەکەم
سەیری ئەم زنجیرەکەن، وەک زیوەری شاهانەیە
بووکی ئازادیم دەوێ، خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێ ی
حەلقە حەلقەی پێوەنم، بۆ پلپلە و لەرزانەیە
گەرچی دوژمن وائەزانی من بەدیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندانم (قوتابی خانە)یە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قوڕ بەسەر ئەو دوژمنە، هیوای بەبەندیخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادی یە
تۆپ و شەستیرو کەلەپچە لام وەکو ئەفسانەیە



چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکا
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە، کردەوەی شێرانەیە
چەکی شۆڕشگێڕی من، نووسین و بیرو باوەڕە
ڕاپەڕینە هەڵمەتە، پڕ نەعرەتەی کوردانەیە
گەر بەئازادی نەژیم، مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن.. کاری نامەردانەیە
قانعم ئەمرۆ لە زیندانا، بەئازادی ئەژیم
سەد هەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە.

قانع لە ساڵی 1963 لەگەڵ وریای کوڕی لە ئێران و بەندیخانەی شا دا بەند دەبێ، وەک بورهانی کوڕی دەنوسێ، شاعیر لە بەندیخانەدا نەخۆش ئەکەوێ و هیوابڕاوی ژیان ئەبێ، دیارە بێ هیواییەکە بەهۆی نەخۆشی و لاوازی جەستەییەوە بووە، نەک بێهیوایی ژیان و خەبات. چونکە ئەم شیعرە بەرزە کە لەنێو بەندیخانەدا نووسراوە، نەک هەر تەنیا هیواو ئومێدو خەبات و خۆڕاگری شاعیر خۆیەتی، بەڵکە خەبات و تێکۆشان و قوربانیدانی مێژوویەک و میللەتێکە. ئەم شیعرە پیت بە پیت و وشە بە وشەو ڕستە بە ڕستە دێڕ بە دێڕی، خۆڕاگری و ڕاستگۆیی و خەبات و هیوای لێ دەچۆڕێتەوە، نەک قانع و میللەتی کورد بە گرتن و لێدان و بەندیخانە بێهیوا نابن، بەڵکە بەم خۆڕاگری و خەباتە بەردەوام و ئازادیەی نێو بەندیخانە دوژمن بێ هیوا دەکەن، لەوەی هیوای بەوە بێت، کە قانع و میللەتەکەی بە گرتن و لێدان و بەندیخانە واز دێنن و بێهیوا دەبن. قانع بەو کارەی دوژمن، دوژمن بە قوڕبەسەری دەبینی و لەحنەت لەوانەش دەکات کە نۆکەری دوژمن و بێگانەن، واتە قانع نەک هەر خۆی بەردەوامە لە خەبات و هانی خەباتکاران دەدات، بە شۆڕشی بیرو باوەڕو قەڵەم، سەدهەزار لەحنەت لەوانەش دەکات کە خەبات ناکەن و دەبنە نۆکەری ئەم بێگانەیە.

ئەم شیعرە ئەوەندەی لەگەڵ خەبات و باوەڕی قانع دێتەوە، سەد هێندەش دەربڕی خەبات و قوربانیدانی بەردەوامی میللەتی کوردە. لێرەدایە

شاعیری ڕاستگۆ دەربڕی ناخی ڕاستەقینەی میللەت و سەردەمە. زۆرکەس لە لێکۆڵەران قانع بە شاعیری چەوساوەکان ناو دەبەن، ئەمە زۆر ڕاست و بەجێیە، بەڵام هەر قانع سەد ئەوەندەش شاعیری نەتەوەی کوردە. واتە قانع خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی تێکەڵ کردووەو خەباتی گەرم و بێ پسان بۆ کردووە. هەر ئەم شیعرە نموونەیەکی بەرزی یەک هەڵوێستی شاعیرە، ئەم هەڵوێستەی کە لە سەرەتا هەڵی بژاردووە و قوربانی بۆ داوە، ئەوەتا لە پێناو ئەم هەڵوێستە – ئێستا – ئێستای نێو بەندیخانە ئاخرینماڵی ژینیەتی و قانعە بەوەی کە بە ئازادی لەنێو بەندیخانەدا دەژی، کە دەنووسێ، قانعم، واتە ئەوەتا من ئەو کەسەم قانع کە لە سەرەتاوە تا کۆتایی و ئاخرین ماڵی ژینم، یەک هەڵوێستم هەبووە و هەیە. بەو ماڵی ئاخیرەش – کەبەندیخانەیە – ڕازیم و قانعم.
لە کۆتاییدا ئامانجی ئەم نووسینە لەچەند خاڵێکدا کۆدەکەینەوە.
-1 قانع هەر بیرو باوەڕێکی هەبووبێ و هەر کارێکی کردبێ و لە هەر شوێنێکدا ژیابێ، هەر یەک هەڵوێستی هەبووە: ئەویش خزمەت بە کۆمەڵ و نەتەوە بووە.
-2 قانع لەپێناو ئەو باوەڕو هەڵوێستەدا زۆری برسێتی و دەربەدەری و ئازار و بەندیخانەی دیوە.
-3 قانع شەڕو ململانێی زۆری لەگەڵ جەستەی خۆی و نەفسی خۆی و دەرونی خۆی و دەوروبەر و ئاغاو دەرەبەگ و حکومەت و داگیرکەران کردووەو بەردەوام لەنێو ئەم ململانێیەدا بووە.
-4 قانع ئەوەی کە باوەڕی پێی هەبووە، پاراستوویەتی و گوێی بە لۆمە و تیر و توانجی کۆمەڵگا نەداوە و بڕوای بە مانەوەو سەرکەوتنی دواجاری ڕاستی هەبووە، هەتا ئەگەر دوای مردنی خۆشی بێت.
-5 قانع لە هیچ دەسەڵاتێکی نێو کۆمەڵگا و وڵات و دەوروبەر نەپەنگاوەتەوە و لە کات و شوێنی پێویست بەگژیدا داهاتووتەوە و قوربانی بۆ ئەم هەڵوێستانەش داوە.
-6 ئەم هەڵوێستانەی قانع چەند بەشیعرەکانیەوە دیارن، هێندەش بە وێنەکانیەوە، ئەو وێنانەی کە بڵاو کراونەتەوە.
-7 قانع لەگەڵ یەک هەڵوێستی خۆیدا، بەرهەمێکی شیعری هەمەڕەنگی بەرهەمهێناوە، لە ڕووی بابەت و شێوازەوە.





# نامەی شیعری قانع



**دکتۆر تاهیر محەمەد عەلی**

نامە، ئەو ئاخاوتنەیە کە دەنگت ناگاتە یەکێک ڕووبەڕوو گفتوگۆی لەگەڵدا بکەیت دێی بە نووسین پێی ڕادەگەیەنیت. ئەوەی کە مەبەستە ئەو نامەیە بە ئاوێتەی دەروون و وێنەیەکی خۆیەتیی ڕاستی نامەنووسەکە دادەنرێ و ئەو نامانە بەشێکی زۆریان بە شیعر بوون و مەبەستی خۆیان بە شیعر دەربڕیوە و لە ئەدەبی کوردیدا چەند نامەیەک کە بەشیعر نوسراون لەنێوان شاعیر و ئەدیبەکاندا ئاڵوگۆڕی پێ کراوە و دەبینرێ.

لەوانە نامە بەناوبانگەکەی نێوان دوو شاعیر نالی و سالم کە نالی لە شامەوە بۆ سلێمانی ناردووە و وەڵامی نامەکە، نامەکەی سالم-ە کە لە سلێمانییەوە بۆ شامی ناردووەتەوە. کە بە دوو چامەکەی نالی و سالم لە ئەدەبی کوردیدا بەناوبانگە. هەروەها ئەو نامەیەی کە حاجی قادری کۆیی لە ئەستەمبوڵەوە ناردوویەتی بۆ جەلیزادەی کۆیە. هەروەها ڕەنجوری و مەلەویش گەلێ نامەیان بە شیعر بۆ دۆست و ناسیاوانی خۆیان ناردووە.

هەر بەم جۆرەی ئەمانیش قانعی شاعیریش نامەی بە شیعر نووسیوە و دەمە تەقێی شیعری لە

نێوان خۆی و شاعیرانی هاوچەرخیدا ڕووی داوەو وەڵامی نامەکەشیان بە نامەی شیعری بۆ نووسیوەتەوە.
قانع لەیەکێ لە نامە شیعریەکانیدا کە بۆ مێژوونووسی کورد (محەمەد ئەمین زەکی بەگ) نووسیوە، کاتێک ئەم شیعرەی نووسیوە کە لە قەرەداغ بووەو لە ڕۆژنامەی ژینی ئەو سەردەمەدا بڵاوی کردووەتەوە کە لە ژینی ژمارە (584) ساڵی 1939ز بڵاوی کردۆتەوە و داوای وەڵامەکەشی لە مێژوونوسی کورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ کردووە.
لەو شیعرەیدا پرسیارێکی مێژوویی لێ کردووە، لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە شاعیر یەکەم کەس بووە کە بە شیعر نامەی لەبارەی بابەتێکی مێژووی ناوچەکەیەوە بنووسێ بۆ مێژوونووسێک داوای ڕوونکردنەوەی لێ بکات، شاعیر سەرەتای دەستپێکردنی پرسیارەکە بەشێوازێکی هونەری وا دەستی پێ کردووە. وەسفکردنی مامۆستا (محەمەد ئەمین زەکی بەگ)، کە مامۆستای زاناو شارەزای مێژووی کوردو کوردستانە و داوای تەمەندرێژی بۆ ئەخوازێ، بۆ ئەوەی بەردەوام بێ لە خزمەتکردنی کوردو کوردستان، بۆ ساغکردنەوەی مێژووی باو و باپیرانمان، چونکە تۆ ئەو مێژووەت بۆ کورد ساغ کردووەتەوە و نەتەوەی کوردیش هیچ کاتێک لە نەتەوەکانی دراوسێی کەمتر نییە.
شاعیر لەپاش ئەم وەسفکردنەی بۆ مامۆستای مێژوونووس ئینجا وردە وردە دێتە سەر پرسیارەکەی و پێی دەڵێ ئێستا من لە قەرەداغم و داوای لێ دەکات کە ئەو سارە گەورەیە و ئەو هەیکەلە گەورەیەی کە لەدەربەند گەورە بۆمان ڕوون و ئاشکرا بکات بۆ ئەوەی دانیشتوانی ناوچەکە بزانن کێیە؟ ئایا ئەو پیاوە پیاوێکی کوردە یان عیساییە یان عیبریە؟ داواکارم لە بەڕێزتان کە ئەم نهێنیەمان بۆ ڕوون و ئاشکرا بکەیتەوە بۆ ئەوەی لای کورد و دانیشتوانی ناوچەکە ئاشکرا بێت، چونکە شاعیر ویستویەتی لە ڕێگای داواکەیەوە ئەوە بۆ هەموو گەلی کورد ڕوون بێتەوە لایان ئاشکرا بێ کە مێژوویان ئەگەڕێتەوە بۆ کەی و کێ دروستی کردووە؟ و بۆچی لەوێ دروست کراوە؟ بۆ ئەوەی هەموو میللەتەکەی ئەم ڕاستیانە بزانێ بۆیە شاعیر داوای کردووە و دەڵێ:

(بۆ معالی ئەمین زەکی بەگ)
مامۆستای زانا سەرچاوەی عیرفان
تەئریخ نووسەکەی خاکی کوردستان
هەتا ئەگاتە ئەوەی ئەڵێ:
مەمنوونی لوتفین بۆمان مەعلوم کەیت
ئەم گرێ زلە لە دڵمان لابەیت

کاتێک مامۆستای مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ، ئەو شیعرەی قانع دەبینێت لە ڕۆژنامەی (ژین)دا کە بە وەسفکردنی ئەو و لە پاشاندا ئەو پرسیارەی لێ کردووە، (محەمەد ئەمین)یش لە ژینی ژمارە 587دا کە سێ ژمارەی دوای پرسیارەکە دەکات، بە شیعر وەڵامی قانعی شاعیر دەداتەوە، لە سەرەتای شیعرەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە لە ڕۆژنامەی "ژین"دا بینیویەتی وەڵامەکەی ئەمیش هەر لە "ژین"دا دەبێت، کە ئەمیش لە سەرەتای دەستپێکردنیدا باسی جوانی و شیرینی شیعرەکانی قانع دەکات کە دەڵێ پێویستە لەسەر ئەو شیعرانەی ستایش بکرێ. لەپاش ئەو وەسفکردنە، دێتە سەر بەشی دووەمی شیعرەکەی کە وەڵامدانەوەی پرسیارەکەیەتی کە دەڵێ زانایانی ئاسار بۆ ئەو هەیکەلە پێمان دەڵێن کە پاشماوەی چەند هەزار ساڵە و ماوەتەوە، کە هەیکەلی (نارام سین)ە. (نارام سین)یش پاشای ئەکەدی بووە بۆ شەڕکردن لەگەڵ (لۆلۆ و گۆتو) دا هاتوونەتە ئەو ناوچانە شەڕی لەگەڵدا کردوون و بەسەریاندا زاڵ بووە، ئەو نووسراوانەی لەسەر ئەو بەردەیە باسی ئەو شەڕە دەگێڕنەوە و چەکی ئەو سەردەمەش نیشان داوە کە بریتی بوون لە تیرو کەوان، چونکە وێنەی تیرو کەوانیش لەلای هەیکەلەکەوە کراوە، ئەو شاخەیان تاشیوە و کردویانە بەو هەیکەلە، لە دەربەندی گەورە،

لەبەرئەوەی ئەو شاخە بەرزەیان تاشیوە و ئەو هەیکەلەیان لێ دروست کردووە تاکو بە بەرزی لەوێدا بمێنێتەوە و دەستکاری نەکرێ، قانع ئەو پیاوەی خستۆتە سەر ئەوەی بە شیعر یا نەزم وەڵام بداتەوە.
کە دەڵێ:

**لە ڕۆژنامەی ژین لە سێی ڕەمەزان**
**هەشت شیعرم بینی زۆر شیرین و جوان**
**هەتا ئەگاتە:**
**لەدوای سی عەسرێک ساسانی هاتوون**
**زۆر تیمسالایەن بوو بە دەستەڵات بوون**

قانع لە سەردەمی ژیانیدا دەمەتەقێی شیعری لەگەڵ یەکێک لە شاعیرەکانی هاوچەرخی خۆیدا هەبووە لەوانە مەدهۆشی شاعیر کە بەرلەوەی قانع ببینێ لە ڕۆژنامەی ژیندا شیعرێکی دەربارەی قانع بڵاوکردۆتەوە و قانعیش لەپاش بینینی شیعرەکەی لە ڕۆژنامەی ژیندا وەڵامی داوەتەوە. مەدهۆش لە شیعرەکەیدا دەڵێ بیستومە شاعیرێک هەیە بەناوی قانعەوە کە فەیلەسوفێکی زانایە، من هەر کەشکۆڵێکم بخوێندایەتەوە یان هەر ڕۆژنامە و گۆڤارێکی ئەو سەردەمە شیعرێکی قانعی تێدا بووایە لەلای خۆم دەمنووسیەوە، چونکە بەلامەوە زۆر جوان بووە هەرچەند شاعیر خۆشیم نەدیببوو بەڵام بەئاواتەوە بووم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم شاعیرە کە ئەو شیعرە جوانانەی دەنووسی و بمبینیایە کە شیعرەکانی بەلای مەدهۆشەوە وەکو شەمامەیەک وایەو ئەو بۆنە خۆشەی زۆر زوو بڵاو دەبێتەوە. بۆیە وتوویەتی:



**بیستوومە قانع هەیەو شاعیرە**
**فەیلەسوفێکی زاناو ماهرە**
**هەر کەشکۆڵێکم ئەکەوتە بەرچاو**
**یا گۆڤارێکم ئەدی ناوبەناو**
**بەشیعری قانع ڕەنگین کرابوو**
**گەلێ شیعریشم لای خۆم نووسیبوو**
**زۆرم لا جوان بوو، خۆیشم نەدیبوو**
**هەر ئەمووت خۆزگە ئەم شەمامەیە**
**بۆنی وا خۆشە ڕەنگی کامەیە**

شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر وەسفەکەی و دەڵێت ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ڕێکەوت پیاوێک بە بەردەم دوکانەکەمدا دەڕۆیشت زۆر بەبێ زاری و بێتاقەتانە ملی ڕێگای گرتبوو، بەپەلە یەکێک لە هاوڕێکانم مژدەیان دامێ کە ئەو شاعیرەیە کە تۆ بەئاواتەوەیت ببینیت و شیعرەکانی کاری تێ کردوویت کە ئەویش قانعی شاعیرە بەپەلە سەرێکم لە دوکانەکەم کێشایە دەرێ بۆ ئەوەی ببینم بەڵام چیم بینی؟ پەشیمانم لە بینینی، خۆزگە هەر نەمدیایە بۆیە وتوویەتی:

**بەڕێکەوت وابوو، خۆی هات بەوێدا**
**بەبێ تاقەتی ئەڕۆی بەڕێدا**
**وتیان: ئەوەتا، مژدەمان بەرێ**
**منیش سەرێکم کێشایە دەرێ**
**کە دیم زەلامێک زەبەلاح و بەرز**
**چڵکن، خواروخێچ، وەک سێوی بن عەرز**
**گری تێ بەردەی بۆسۆی لێ نایە**
**زۆر پەشیمانم، خۆزگە نەمدیایە**
**درۆ بۆ بکەم، قسەی ڕاست خۆشە**
**کە دیم وامزانی دەمار فرۆشە**
**تێر تێر پێکەنیم بەم سینەمایە**
**وتم چۆن شاعیر ئاوا، ئاوایە؟**
**ئەم هۆنراوانە هی ئەم پیاوەیە**
**ڕاستە کە خەزنەش لە کەلاوەیە!!**
**هاوڕێیەکی خۆم لێم هاتە پێشێ**
**وەختە بوو گوێچکەم لەبن دەرکێشێ**
**وتی: هەی نەفام! دەمی خۆت بگرە**
**ڕەخنە لە سیمای شاعیران مەگرە**
**شاعیر کەی لەمە چاتر ژیاوە؟**
**نابینی پاکی بە خەم فەوتاوە**

پیرەمێردی ڕۆژنامەنووسیش ئەم تاکە دێڕە شیعرەی لە کۆتاییەکەوە نووسیبوو:

**ڕەخنە لە کاری خوایی مەگرە**
**بۆچی پیرەمێرد لەو پۆشتەترە؟**

قانعیش هەر کە شیعرەکە دەبینێ لە ڕۆژنامەی ژینا ئەمیش هەر لەو ڕۆژنامەیەدا بە شیعر وەڵامی شاعیری هاوچەرخی مەدهۆش دەداتەوە پێی دەڵێ ئەوەتا ژیانی شاعیرانی کورد بەو شێوەیە کە بینیوتە منیش تاوەکو فەردێک بم لەو شاعیرانەی کورد لەوە چاکتر نامبینی، بۆیە لەوەڵامدا وتوویەتی:

**برای خۆشەویست برای نەدیدەم**
**شاعیری بەرزی زۆر پەسەند دیدەم**
**لە برادەران، بۆ منت پرسیبوو**
**لەناو گۆڤارا شیعرت نووسیبوو**
**منت نەدیبوو، ئایا کە چۆنم**
**پێت نەزانیبوو، کە کەوڵەکۆنم**
**نووسیبووت، هەرگیز بۆسۆی لێ نایە**
**زۆر پەشیمانم خۆزگە نەمدیایە..**
**بەڵێ ڕاست ئەکەی هەمیشە ڕووتم**
**چلکن و پلکن وەک مەڵکەمووتم**
**هەتا شاعیری کوردستانت بم**
**ئەبێ هەر شڕ و شیتاڵانت بم**

شاعیر بەردەوام دەبێ لە وەڵامدانەوەی پێی دەڵێ؛ بۆچی هەر ئەبێ جل و کەواکەت فاسۆن بێ و بە کراس و مێزەری زل و پێڵاوی نوێ لە پێتا بێت ئەوجا ڕێزت لێ بگیرێ ئەگەر بە پۆشاکی نوێ و ڕێک و پێکەوە نەبێ ئیتر ڕێزت لێ ناگیرێ ناوبانگیشت نابێ بۆیە وتوویەتی:

**بۆچی براگیان هەر فاسۆن پیاوە؟**
**قۆندەرەی تازە خاوەنی ناوە؟**
**کراس و کەوا خادەمی هۆزە؟**
**مێزەری زلە هۆی بەرزی کۆزە؟**

شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر وەڵامدانەوەکەی و پێی دەڵێ کە تۆ شاعیری نابێ ڕەخنە لە شاعیران بگری چون هیچ کاتێک ژیانی تۆ لە من باشتر نییە، شاعیران تەنها لە دوورەوە دەنگیان خۆشە و لە نزیکەوە دارێکی بۆشن، بۆیە وتوویەتی:

**برای شیرینم خۆ تۆش شاعیری**
**زیرەک و زانا تەواو ماهیری**
**مادامێک کە خۆت گەوهەر فرۆشی**
**بۆ کزی شاعیر بۆچ تێئەکۆشی**
**شاعیر وەک دەهۆڵ لە دوور دەنگ خۆشن**
**لە نزیکەوە دارێکی بۆشن**

شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر وەڵامدانەوەی مەدهۆش پێی دەڵێ ڕەش و ڕووتی و هەژاری عەیب و عار نییە، کە تۆ پارەت نەبوو دەسەڵاتت چییە؟ شاعیر نەفرەت لەو پارانە دەکات کە بە ڕێگای ناشەرعی دەست دەکەون، پاروویەک بەو شێوەیە دەست بکەوێت من دەیکەم بە سندان. لێرەدا نەفسبەرزێتی-ی شاعیر دەردەکەوێ کە هیچ کاتێک ناگۆڕێتەوە بە پارەو هیچ کارێک ناکات کە هەوڵی پارە کۆکردنەوە بدات بە ڕێگایەکی ناپەسەند. گرنگ ماڵ و سامان نیە بەلای شاعیرەوە، گرنگ سەرکەوتن و سەربەرزی گەلەکەیەتی، پێی دەڵێ ئەو شاعیرانەی کە دەستپاک و ڕاستگۆ و چاوساغ بوون کامیانت بینیوە کە جل و بەرگی باشیان لەبەردا بووبێت، بەلایانەوە جل و بەرگ گرنگ نەبووە بەڵکو سەرکەوتنی گەل بەلایانەوە گرنگ بووە.



ئەوەتا شێخی سەعدی کە فەیلەسوف و زانا بووە مامۆستای شاهۆو گەدا بووە بە پێ خاوسی ماڵەو ماڵی کردووە هیچ کەسێک پێ نەوتووە ڕووتەو ناشرینە و پێ خاوسە. لە کۆتایی شیعرەکەیدا کە وەڵامدانەوەیەتی دەڵێ با ئیتر بەس بێ منیش تەمەنا دەکەم کە تۆ هەر نەبینم، بۆیە وتوویەتی:

**باوەجو ڕووتی هیچ عەیبی نییە**
**کە پارە نەبوو، دەسەڵات چییە**
**پارە بەجۆرێک دێتە دەس ئینسان**
**شاعیر ئەو پارە ئەکا بە سندان**
**شاعیر بۆ پارە هیچ ناکا پەلە**
**ئارەزووی شاعیر هەر بەرزی گەلە**
**کام شاعیرت دی دەس و چاو پاک بوو؟**
**لیباسی بەری فاسۆنی چاک بوو؟**

**سەعدی–ی فەیلەسوف تەواو دنیا بوو**
**مامۆستای هەموو شاهۆ گەدا بوو**
**بەپێ خاوسی لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ**
**ئەسوڕایەوە، سا بە هەر ئەحواڵ**
**هیچ کەسێک نەیووت بۆچ سەعدی ڕووتە**
**بۆچی ناشرین وەک مەلکەمووتە**
**ئێتر بابەس بێ برای شیرینم**
**منیش هەر ئەڵێم یاخوا نەت بینم**

کەواتە ئەمەی سەرەوە دەمەتەقێیەکی شیعری بوو لەنێوان قانع و مەدهۆشدا کە لە ڕۆژنامەی ژینی ئەو سەردەمەدا بە شیعر لە نێوانیاندا ڕووی داوەو وەڵامی یەکتریان داوەتەوە.

ئەو نامانەی قانع کە بۆ شێخ عوسمان (سراج الدین)ی نووسیوە دیارە شاعیر لەم شیعرانەیدا ستایشی کردووە و خۆی بە موریدی ئەوان زانیوە، ئەمەش ئەو سێ پارچە شیعرەیە کە شاعیر بۆ شێخی نووسیوە لە پارچەی یەکەمدا ویوویەتی.

یەکەم و دووهەم و سێهەم مەدەدێ:
پەرێشانی دڵم ئەمرۆ بەهیوای لوطفی (عثمان)ە
کە خاکی مەقدەمی بێ شک دەوای دەردی دڵ و گیانە
ئەگەرچی دیار نیم و بە چەشنی زەڕڕە ناپەیدام
بەڵام دەرکەوتنم قوربان، بە شوعلەی شەمی تابانە



چ خۆشە هەڵتروشکنێ لەبەر قاپی مورادی تۆ
بەشەرتێ تۆش بڵێی یاران ئەو یارۆی مەریدانە
مەلا نازی بە عیلمە، سۆفی فەخری ویرد و ئەورادە
منیش ئوممیدی دارەینم لەلای تۆ لوطفی جارانە
مەفەرموو بۆ نەهات، ئەڵبەت نەماوە شۆرو ئیخلاصی
بزانە مانیعم پیری و خەتای سەرماو بارانە
لەبیرم دێ ئیمزام (قانع العثمانی) دانابوو
بڵێم چی ئیستە بەدبەختم ئەڵێن مونکیر بە شێخانە

بەچاوی باطینی بڕوانە قوربان بۆ دەروونی دڵ
ئەزانیت (قانع)م مەحکەم لەسەر ئەو شەرت و پەیمانە

تەماشای ئەم شیعرەی شاعر بکەین کە بۆ شێخی "سراج الدین"ی نووسیوە پەرێشانی خۆی دەربڕیوە بۆی بە هیوای ئەوەیە کە شێخ لوطفی بۆی هەبێ، ئەگەرچی ناتوانم زوو سەردانت بکەم بەڵام دڵم ئاگرێکی وەهای تێدایە کە هەرگیز کوژاندنەوەی نیە قوربان، زۆر پێم خۆشە کە لەبەر دەرگاکەتا قوربان هەڵتروشکنێم بە ڕۆژ و بە شەو بەڵام تۆش پێم بڵێ کە ئەو مەریوانی واتە شاعیر لێرەدا کاریگەری شارەکەی کە زێدی باو باپیریەتی زیندوو بکاتەوە و لەبەردەم موریدەکانیا پێی بڵێ ئەمە قانعی مەریوانییە.
بەشێخ دەڵێ ڕێزی مەلای زانستەکەی و ڕێزی سۆفێتی ئەو وێردو تقوسانەی کە دەیگێڕن بەرامبەرتان منیش هیوام ئەوەیە کە وەکو جاران لوتفت بەرامبەرم هەر مابێ و ئەڵێم کە نەهاتنم بۆلای جەنابتان سەبەبی هەیە کە یەکەم پیرییەو دوو نەخۆشین و سێیەمیش باو بارانە، وە پێی دەڵێ "ان شاء الله" هەر کاتێک توانیم دێمە خزمەتتان.
لێکدەرەوەی ئەم شیعرەی قانع، عبدالله مصطفی صالح، دەڵێ حەزرەتی عثمان عثمانی سێهەمە، هەر وەکو "ضرب المثل"ە سێیەمینە سوونەتە، ئەو "سێ عثمان"ەیش تەواو بوو، عثمانیش "خاتم العثمان"انە، یەعنی تا قیامەت عثمان سێهەم تەئسیر و بەرەکەتی ئەمێنێ و هیچ عوسمانێکی تر بەو پایەیە شاد نابێ.
پارچەی دووەمی شیعرەکەی کە بۆ شێخی ناردووە بەناوی (یا چرای ئاین مەدەدێ) کە دەڵێ:

**قوربانی خۆم ئەڕۆم، دڵ هەر لەلاتە**
**چاوەڕوانی فەیظی خاکی ژێر پاتە**
**حەیفە وجودی بێ کەڵک و کارم**
**سەر بشێوێنێ لە دڵەی زارم**
**ئەمانەتی تۆو دڵەی بێ نوورم**
**پڕ لە مەرارەت لە سرور دوورم**
**بەعزێ تر مورید ساداتێ گیرام**
**پاک و بێ لەکەو بوقعەی چۆڕ مەقام**
**ئەوانیش خەریک تەواو خۆسازین**
**دوور لە لیقای تۆ کۆچی ناڕازین**

پارچەی سێهەمی کە بۆ شێخی ناردووە بەناوی "قانع و بیارە" شاعیر لەم شیعرەیدا باسی ئەو شوێنەمان بۆ دەکات کە مەنزڵگای شێخی لێیە، وامان پیشان ئەدا کە بە ڕێکەوت ڕێگای کەوتووەتە ئەو شوێنە، ئیتر دەکەوێتە وەسفکردنی ئەو جێگایە و ئەو شوێنە پیرۆزە کە مەڵبەندی تەریقەت و عیرفانە و وردە وردە باسی ئەو کەسانە دەکات کە دێنە ئەوێ بۆ وەرگرتنی تەریقەت و باسی ئەو کارانەشمان بۆ دەکات کە لەوێ دەیکەن.

با گوێ لە قانع خۆی بگرین کە چی دەڵێ:

**بەڕێکەوت ڕێکەوت ڕۆژێ لە ڕۆژان**
**هاتمە (بیارە) مەعدەنی عیرفان**
**زوو بۆم کرا بوو باسی ئەوصافی**
**سەرچاوەی فەیزی بێ لەکەو سافی**
**نەیانوت بێ شک کانی موڕادە**
**ڕێگەی نەجاتی ڕۆژی مەعادە**
**کەهفی ئەمانە بۆ خەتاباران**
**مەنزڵگای تەوحید بۆ تەقواکاران**
**کە نواڕیم فەیزی لەبەر ئەباری**
**عەرش بوو بۆ لیقای حەزرەتی باری**
**گرۆی شەو خێزان دەروون ئاوەدان**
**ماتەم نشینان بە ظاهر وێران**
**ڕوانیم خەلایق ڕیز ڕیز و قەتار**
**ئەجووڵێنەوە هەزار بە هەزار**
**یەکێ دڵگەرمی صەدای قورئانخوێن**
**بە تیری عەشقی یەکێ دڵ پڕ خوێن**
**یەکێ موبتەدی لە عیلمی فەنا**
**یەکێ شەهسوار مەیدانی بەقا**
**یەکێ خەریکی عیلمی ظاهیر بوو**
**یەکێ مەنظور بوو، یەکێ ناظیر بوو**

شاعیر هەر لەو شیعرەیدا بەردەوام دەبێ و بۆمان دەردەخات کە ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕووئەکەنە خانەقای شێخ و لەوێ نان دەخۆن، ئەویش بەهۆی پرسیارکردنی لەو کەسانەی کە لە نانەواخانەکەی خانەقادا کاردەکەن و پێی دەڵێن ئەو ڕۆژانەی کە خانەقا میوانی کەم بێ، ئەمان هەشت پووت ئارد ئەکەن بەنان و ڕۆژانی دیکەش هەیە ئەو هەشت پووتە کەمە و ئاردی دی دەشێلن. کەواتە شاعیر دەیەوێ پێمان بڵێ کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕۆژانە لەوێ نان دەخۆن بۆیە وتوویەتی:

**ڕۆییم، گەییمە نانەواخانە**
**برسێتیم بۆ خۆم کرد بە بەهانە**
**داخڵ بووم بەناو ژووری نانکردن**
**دانیشتم لە پێی کولێرە خواردن**
**وتم: نانەوا خۆت و ئیمانت**
**ڕۆژێ چەندێکە مەسرەفی نانت؟**
**وتی: هەر ڕۆژێ میوانمان کەم بێ**
**هەشت پووت ئەشێلم، خاتری جەم بێ**
**بەعزێ ڕۆژ میوان نایەتە تەحریر**
**دە تەنەکە ئارد ئەکەم بە هەویر**
**هێشتا بەش ناکات ئەشێ دووبارە**
**هەویر بشێلم، چارم ناچارە**
**خۆم و چوار شاگرد هەتا نیوەشەو**
**ئارامان نییە بە دەوانی دەو**

شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر شیعرەکەی ئیتر دەکەوێتە وەسفکردنی خانەقاو ئەو خەڵکە زۆرانەی کە لەوێن و شاعیر بە چاوی خۆی دەیانبینێ لە خانەقادا و باسی پۆل پۆل بەستنی خەڵکەکانمان بۆ دەکات کە پۆلێک نوێژ دەکا و پۆلێک خەریکی تەریقەت وەرگرتنە و پۆلێکی تریش خەریکی



خوێندنی قورئان و پۆلێکی تریش بە دەنگی بەرز هاوار دەکەن "یا الله". با گوێ لە شاعیر خۆی بگرین کە چۆن وەسفی ئەو پۆلە خەڵکانەمان بۆ دەکات کە لەناو خانەقەدان و پۆل پۆل دابەش بوون، پێمان دەڵێ:

**لەوێ تێپەڕیم چوومە خانەقا**
**تەماشا ئەکەم وەک (یوم البقا)**
**صەفێ نوێژ ئەکا، صەفێ مەشغوولە**
**صەفێ لە یادی شاهی ڕەسوولە**
**گاهێ نەعرەتەی (یا الله)ی شەیدا**
**ئەگاتە حوزوور عەرشی بارەگا**

هەتا ئەگاتە:

**بەسۆزی دەروون ئاهی نیوەشەو**
**ڕووبەڕووی مەقصەد بی ئارام و خەو**
**کاروانە ڕێگەی کۆچ، سارای مەحیبەت**
**سەر حەڵقەی حەڵقەی شۆری طەریقەت**

شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر شیعرەکەی پاش وەسفکردنی خانەقاو موریدەکانی دەکەوێتە باسکردنی شێخی "سراج الدین" کە ئەویش شێخ عوسمانە و باسی ئەو کارانە دەکات کە شێخ کردوویەتی لەوکاتەدا و کە ئەم بینیویەتی، بۆیە لەو ڕووەوە شاعیر وتوویەتی:

**ڕووم کردە مەجلیس شای (سراج الدین)**
**(عثمان)ی ئایش، سەرچاوەی یەقین**
**موجەددیدی دین ڕەسوڵی ڕەهبەر**
**وەکیلی موتڵەق شای (خیر البشر)**
**خەریکی ئیرشاد ڕێگەی خودا بوو**
**لەسەر تابەپێی غەرقی لیقا بوو**
**بە دەس کیتابەت، بە دەم نەصیحەت**
**بە چاو تەوەجوهـ، بە ڕۆح هوشیاری**
**بەردەوام دەبێ هەتا ئەگاتە**
**بە ضیای شای (سراج الدین)**
**عوسمانی ئالیث موجەددیدی دین**
**بمخەرە زومرەی مەنسووبی دەرگای**
**بێ بەشم نەکەی لە سایەو سەرای**



قانع لە کۆتایی ئەم شیعرەیدا واتە لەدوا دێڕیدا ئەو شتانەی کە لە خانەقادا بینیویەتی دیارە کاری تێ کردووە، بۆیە لەم تاکە دێڕەی کۆتاییدا دەیەوێ بەرە و تەریقەت بڕوات کە ئەو خەڵکە لە خانەقادا گرتوویانەتە بەر کە ئەویش سۆفیەتییە، پێمان دەڵێ کە لەوەوپێش سەرگەردان بووە نایەوێ لەمەو پاش چیتر سەرگەردان بێ و دەیەوێ ببێ بە سۆفی بۆیە وتوویەتی:

**با ئیتر بەس بێ لەسەرگەردانی**
**فرسەتە (قانع) بگرە دامانی**

شێخیش لە وەڵامی ئەو نامە شیعریانەی قانعا کە بۆی ناردووە بەهەمان شێوەی ئەو بە شیعر وەڵامی دەداتەوە باسی زیرەکی و هۆشیاری و بەتوانایی قانع دەردەخات و کۆمەڵێ شتی پێ دەڵێ بۆیە وتویەتی:

هۆشیاری حەشاری خیرەدی دەرکی نەچیران
صەبیادی کەوی زیرەکی مورغانی سبەینان
چەند خۆشە سبەینانە کە گوێ دەگری لە دەنگی
نەظظارە دەکەی خاڵی مل و لەنجەی جەیران
ئەوکاتە کە پێکات بە پێیەکانی خەدەنگت
یا ڕەب نەشکێ پەنجەیی سەرما شەیی شێران
بەردەوام دەبێ تا دەگاتە
نەشئەی فەرحی تۆیە لە دڵ و وەرنە دیارە
کەی دێتە مەصافی غەزەل و هەزلی فەقیران
(عثمان) بە خودا غەیری خودا کەس نیە بیکا
تیمار و دەوای دەردی دڵ زاری زویران

قانع نامەیەک دەنووسێ بۆ حەزرەتی شێخ و لەسەر پاکەتەکەی ئەم تاکە دێڕە شیعرەی بۆ دەنووسێ:

**دڵم زەرف و وەکیلم زەرفە بۆڵات**
**کە ماچی کا لە تەوقی سەر هەتا پات**

**شێخیش لە وەڵامی ئەم دێڕە شیعرەی قانعدا بەم دوو دێڕە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:**

**مەزرووفی نامەم هەناردم بۆ یار**
**پاک جوانە خاڵییە لە غوبار**
**(کآنە)راس دڵی دانامە**
**بۆلای ئەدیبی زاناو دانامە**

ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار تایبەتە بە

هونەرمەندی کۆچکردوو

# عوسمان چێوار





# پێچەوانەبوونەوەی وێنەکان لە شیعری "چۆنیەتی زەمانە"ی قانع دا



نەجات نوری

چۆنیەتی زەمانە
بێ حەیایی باوە ئەمڕۆ، قوڕ بەسەر دا کا حەیا
کەندەڵان سەربەرز و شادە، خۆی بشارێتۆ چیا
گوڵ ئەگەر ئەقڵی ببێ، قەت سەر لەخاک ناکاتە دەر
چونکە ڕۆژی دڕک و داڵە و گەرمی بازاڕی گیا
با، لە هەورا سەرنیگون بن مانگ یا ڕۆژی جوان
شەمشەمە کوێرە ئەڵێ: من نامەوێ شوعلەی چیا
ئەی فەلەک! ڕاستۆ نەبی، بۆ ڕێک و پێکی دەورەکەت
گورگ ئەبێتە شوانی ڕان و دز ئەبێتە ئەولیا
نێرە گاجووتێ ئەبیتە ڕیزی لوقمانی حەکیم
فەیلەسووفێکیش ئەخەیتە ژێر چەپۆکی ئەشقیا
تۆ بە مێرووولەی زەعیف ئیشی سلێمانی ئەکەی
خاتەمی مۆری نگینت کردە دەست دێوی هەیا

لێکۆلەرەوانی شیعر و ئەو کەسانەی کاریان لەسەر دیوانی شاعیرە کلاسیکیەکانی کورد کردووە و بەدواداچوونیان بۆ ساخکردنەوەی بەرهەمی ئەو شاعیرانە کردووە، وێنەی "قانع"ی شاعیریان جیا کردۆتە

لە زۆربەی وێنەو دەنگی شاعیرە کلاسیکیەکانی تری کورد، قانعیان وەکو ناو، یان وەکو شاعیر، ئەو پێناسەیەیان بەسەردا سەپاندووە، پێی دەڵێن "شاعیری چەوساوەکان" ئەم جیاکارییەش تا ڕادەیەک ڕەنگە لە جێگەی خۆیدابێت، چونکە شیعرەکانی قانع لە شیعری هەموو شاعیرەکانی تری ئەو قۆناغە زیاتر کاری لەسەر تێڕوانین و ئازارەکانی کۆمەڵگا کردووە و ڕۆچۆتە ناو ژیان و برینەکانی کۆمەڵگای ئەو ڕۆژگارەی کە تێیدا ژیاوە.
قانع تێڕوانینی فراوانی هەبووە بۆ ستەم و بوونی خەڵکی و لە وێنەی ژیان و تەمەنی کەسەکانی دەوروبەریەوە بەردەوام ئازارەکانی خەڵکی خوێندووەتەوە. ئەگەر قانع شاعیری چەوساوەکان بووبێت و بە شیعر لەسەر مەسەلە ئەخلاقیەکانیان هاتبێتە دەنگ، کە دیوانەکەشی زۆر ناونیشانی شیعری ئاوای تێدایە و ئاماژەن بۆ بەرگریکردن لەو ئینسانانەی کە هەمیشە کەوتوونەتە بەردەم گورزی خراپەکارەکانەوە، هەمانکات وەکو ناونیشانی قانع خۆیشی، ژیان و تەمەنی دوور نەبووە لەو مەینەتییانەی کە لەو ڕۆژگارەدا بەردەوام قانع گیرۆدەیان بووە.
لەم دوو تێڕوانینەوە تێڕوانینێک بۆ ئازارەکانی خەڵک و تێڕوانینێکیش بۆ مەینەتیەکانی تەمەنی خۆی، شیعری قانعیان زیاتر بەلای ئەو ئازارانەدا بردووە کە خەڵک و خۆیشی تێیدا بوونەتە قوربانی، قانع تێڕوانیی بۆ ژیان ڕەنگە زۆر جیاوازتر بووبێت لە تێڕوانینی شاعیرەکانی دیکە، قانع ویستوویەتی بە مرۆڤ بڵێت ئەو جیهانەی تێیدا دەژی زۆر جیهانێکی خۆش و دادپەروەرانە نییە و ناکرێ مرۆڤ زۆر دڵی پێ خۆش بکات، چونکە هەمیشە نادادپەروەریی تێیدا حاکمە، قانع لە خۆڕا ئەو جیهانە ڕەت ناکاتەوە کە مرۆڤی تێدا دەژی، کاتێک لەو جیهانە ڕادەمێنێت ئەوەی دەیبینێت زۆربەی مرۆڤەکان بوونەتە قوربانی تێیدا و ئەوەش دەبینێت ئەوە ئەو جیهانەیە کە بووەتە جیهانی مرۆڤەگەلێک

کە ئەوان دەتوان بە ئازادانەو ئاسوودانە تێیدا بێن و بچن. هەر ئەو کۆمەڵە مرۆڤەن کە بوونەتە دارمانی خەون و چەوسانەوەی مرۆڤەکانی تر.
قانع بەو حەرفانەی هەڵی بژاردوون و لە شیعرەکانیدا جێگەی کردوونەتەوە، دەیەوێت ئەو جیهانە بەو جیهانە دۆزەخییە وێنە بکات کە بوونی خۆی و ئەوانەی وەکو خۆی وان، بەردەوام تێک دەشکێنێت، بۆیە ئەوە قانع خۆیەتی دەیەوێت دووبارە ئەو جیهانە بگۆڕێت بەو جیهانەی کە ببێتە جیهانی هەموو خەڵک، نەک جیهانێک بۆ ئەو کەسانەی کە بە ژمارە هێجگار کەمن و تێیدا بەختەوەر دەبن.
پرسی تاکەکەس و کۆمەڵگا لە شیعری قانعدا پرسێکی هێجگار شێواوە و هەموو ئەو شێواوییەش دەبەستێتەوە بە بیرو ڕفتاری خەڵک خۆیەوە، لای قانع ئەگەر تاک خۆی چاک کرد، ئەوا دەتوانێت ئەو جیهانە شێواوەی تێیدا دەژی باشتر بکات.
قانع لە شیعری "چۆنیەتی زەمانە"دا وێنەی جیهان و ڕۆژگارێکمان بۆ وێنا دەکات کە خەڵک ئیتر دەبنە قوربانیی ڕفتارو بیری کەسانێک کە هیچ جێگایەکیان بۆ بەختەوەری مرۆڤەکانی تر نەهێشتۆتەوە. قانع لەو شیعرەدا لە تێڕوانینی دەروون و جیهانبینیی خۆیەوە پەیوەندیی نێوان تاکەکان و ڕۆژگارمان لە چەند وێنەیەکی دەگمەندا بۆ دیاری دەکات. داوا دەکات ئیتر خۆمان لەو جیهانە شێواوە بەدوور بگرین و دڵمان پێی خۆش نەبێت، چونکە ئیتر جێگای بوونی زۆربەی مرۆڤایەتی تێدا نابێتەوە کە لە هەموو شتێکی باش و جوانی بێبەش کراون. ئیدی هەرگیز ئەوە ئەو ڕۆژگارە نییە کە زۆربەی مرۆڤایەتی داوای دەکەن لە ڕووی ئاسودەیی و بوونەوە.
ئەگەر ئەم وێنانەی ناو ئەم شیعرەی قانع، وەکو تەماشاکردنی ڕۆژگار وەریان بگرین، لە کۆی شیعرەکەدا تووشمان دەبێت بە تووشی ئەو وێنە سەرنجراکێشانەوە کە قانع وەکو خۆی دەیان بینێت و هەستیان پێ دەکات. جیا لە تێرامانی خەڵک،



لای خۆی دەبێتە ئازارێکی کوشندە و حەرف بە حەرف دەست دەکات بە کێشانی ئەو وێنە باو و ترسناکانەی کە دەوری خۆی و کۆمەڵگاکەیانی داوە و بەو وێنانە دوا لە خەڵک دەکات کە جیهانی ئێمە جیهانێکە تەواو شێواوە و نوقمی ڕۆژگارێکی هێجگار نادادپەروەر بووەتەوە.

قانع پەیوەندی خەڵک و ڕۆژگاری لەم شیعرەدا کردووە بە پەیوەندییەکی لێکدابڕاو و ترسناک. هەر بە پەیوەندی مرۆڤەکانەوە نەوەستاوە کە خۆی لە پەیوەندیەکی کوشندەو پڕلە بریندا دەبینێتەوە، بەڵکو کاری لە سەر وێنەی سروشت و گیانلەبەرەکانی تریش کردووە و لە هەر دێڕێکیدا ئەو وێنە سەرنجڕاکێشانە دەبینین کە قانع لێیان داوە. واتا مرۆڤ و سروشت و گیانلەبەرەکانی تریش لەم شیعرەدا گیرۆدەی ئەو ڕۆژگارەن کە لای قانع تەواو پێچەوانە بۆتەوە و هەموو شتە جوان و باشەکان، هەموو ئەخلاقە پیرۆزەکان بوونەتە قوربانیی هەموو شتە ناشیرین و خراپەکار و ئەخلاقە بەربەریەکان.

ڕاستە لەم شیعرەدا قانع کاری لەسەر ڕۆژگارێکی ڕەش و شکستخواردووی بۆ مرۆڤایەتی کردووە و خوێنەر دەتوانێت لەم شیعرەدا گەلێک وێنەی ڕەشی ئەو ڕۆژگارەی کە شاعیری تێدا ژیاوە بدۆزێتەوە، بەڵام دەبینین قانع لە ناونیشانی شیعرەکەوەیەوە بە تەنیا کاری لەسەر ئەو ڕۆژگارە نەکردووە کە بوونی خۆی تێدا بردۆتە سەر، بەڵکو تەواوی شیعرەکە ئاماژەیە بە ڕۆژگارەکانی دیکە و وێنەی زۆر زەمانەی دیکەیش، کە دڵنیام لە هەموو ڕۆژگارەکانی تری مرۆڤایەتیشدا ئەو ڕۆژگارەی ئەم شاعیرە بەو وێنە دەگمەنانەوە لێیان دەدوێت، دەبێتە ڕۆژگاری گەلێک مرۆڤی دی لەسەر زەوی.



ڕۆژگاربینی قانع لێرەدا، بۆتە تێڕوانین بۆ ئەو قوربانییانەی کە مرۆڤ بۆ ژیان و تەمەنی خۆی دەیدات و ئیتر ناتوانێت بەو خواست و ئامانجەی بگات کە کاری بۆ دەکات، سەردەمی هەموو نووسەرو شاعیرێکیش دەبێتە بەشێک لە تێڕوانین و واقعبینی بۆ ڕووداو و ئەو پرسیارانەی تێیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و بەشێک لەو پرسیارو وێنانەی کە دێنە ڕێگەی، لە باش و خراپ، دەیانخاتە ناو بازنەی نووسین و شیعرەکانەوە.

قانع پێ لەسەر ڕۆژگارێک دادەگرێت کە ئیتر ڕۆژگاری هەموو دەموچاوە خراپەکارو وێنە شێواوەکانی ناو کۆمەڵگایە و باقی کۆمەڵگا ئیتر دەبێت ببنە ڕێگای پەڕینەوەی بۆ خۆشگوزەرانی کەسانێک کە بەردەوام ڕۆژگار بۆ بوونی خۆیان بەکار دەخەن. خۆ ئەگەر لەم شیعرەوە جەستەی مرۆڤایەتی لە ڕۆژگاری بوونی قانعدا بخوێنینەوە ئەوا دەبینین جەستەی خەڵکی چەند شێواو پڕ برین و تێکشکاو بووە، شیعرەکە پڕە لە ئاماژەی ترسناک بۆ ئەو ڕۆژگارە و ڕۆژگارەکانی تریش. ئەگەر لەم شیعرەوە ڕۆژگاری قانع بخوێنینەوە دەکەوینە بەردەم گەلێک تراژیدیای مەترسیداری مرۆڤایەتی. دێڕ بە دێڕی شیعرەکە، زۆر ماناو وێنەی قوڵ لەخۆ دەگرن و شاعیر تەواوی ڕۆژگارەکەی خۆی ڕەفز دەکات و پێ لە بوونی هەموو جۆرە مرۆڤێکی بەحەیاو چاکەخواز دەنێت و زەمەنی جەستە خراپەکارەکانمان بۆ دەکاتە کۆی بوونی ئەو کەسانەی کە دونیایان کردۆتە شوێنی مردنی سەرجەم مرۆڤەکاتی دی.

شیعرەکە هەموو ئەو پەیوەندیانەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە دەبێتە پەیوەندی نێوان کەسەکان بۆ ململانێی یەکتری و سەرکەوتنی خواستی ئەو کەمینەیەی کە دەستیان ناوەتە بینی ژیانی خەڵکییەوە. وێنەکانی ناو ئەم شیعرە ئەو وێنانەیە کە شاعیر بۆ خۆی دونیابینیی ڕۆژگارەکەی خۆی پێ وێنا دەکات، ئەویش خۆی لە وێنەی دارمانی بەشێکی زۆری مرۆڤدا دەبینێتەوە. خوێنەر دەزانێت ئەم شیعرە چەند دەبێتە هەڵگری ئەو وێنانەی کە شاعیری لەو ڕۆژگارەدا تێدا ژیاوە لە ڕووی نائومێدییەوە زیاتر لەوەش وێنەکان دەبنە وێنەی نائومێدتر بۆ ڕۆژگارەکانی دیکەیش. هەر ئەمەیە وا دەکات لەیەک کاتدا دوو

ڕۆژگار یان چەند ڕۆژگارێکی تر لە وێنەکانی ناو شیعرەکەدا بدۆزینەوە. هەمانکات دەتوانین ڕۆژگاری سەردەمی قانعی پێ شی بکەینەوە و ئاماژە بە برین و نائومێدبوونی مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە بکەین. دەشتوانین لە ئێستادا هەموو نائومێدییەکانی خۆمانی پێ وێنا بکەین.

قانع بەو وێنە دەگمەنانەی لەم شیعرەدا خستوونییەتیە ڕوو، لێزانانە لەسەر جەستەو وێنە و ئەخلاقیاتی مرۆڤ بۆ ڕۆژگارەکەی خۆی ڕاوەستاوە و وێنەی ئەو جەستانە بە حەرف دەکێشێت کە لەسەر بوونی دونیایەک نائومێدی دەژین. وێنە ونبووەکانی ئەو جەستانە لەم شیعرەدا دەکاتە بانگەوازێک بۆ دەرچوون لەو بانگەوازە درۆزنانەیەی کە ڕۆژگار بە ڕۆژگارێکی باش و خۆش دەزانن بۆ مرۆڤایەتی. شاعیر هەموو ئەو دەنگۆیانە بە درۆ دەزانێت و بە خەڵک دەڵێت ئەمە ئەو وێنە ڕاستەقینانەیە کە ئێمەی گیرۆدە کردووە. دەبینین قانع چۆن چۆنی لە سەرەتای شیعرەکەیەوە دەست دەخاتە سەر برینەکان و ئەو ڕۆژگارەی خۆی تێیدا ژیاوە بە خەڵک ڕادەگەیەنێت:

بێ حەیایی باوە ئەمڕۆ، قوڕ بەسەر دا کا حەیا
کەندەڵان سەربەرز و شادە، خۆی بشارێتۆ چیا

شاعیر لەم وێنانەی ناو شیعرەکەیەوە نەیتوانیوە وێنەی ئەو ڕۆژگارەی خۆی بشارێتەوە و لە ئاست خراپەکارییەکانی دەوروبەریدا بێدەنگی هەڵبژێرێت. دێڕ بە دێڕ دەمانخاتە سەر وێنەکانی ئەو ڕۆژگارە و دەبینین کە چۆن چۆنی ئاماژە بە هەموو خراپەکارییەکان و ڕەشبینییەکانی کاتی خۆی دەکات و تەواوی هەموو وێنەکانی لای پێچەوانە بوونەتەوە کە زەمەنێک بەئومێد بووە بیانگاتێ و ئاسودەیان بکات. کەواتە چی وای کردووە تا قانع ئەو وێنانەمان بۆ بخاتە ناو شیعرەکەیەوە بمانگەڕێنێتەوە بۆ ڕۆژگاری خۆی و شیعرێکمان بۆ بەجێ بهێڵێت کە یەکێکە لە شیعرە پڕ لە ماناو نەمرەکانی ئەو شاعیرە!

قانع لە بوونی حەیاوە دەست دەکات بە ناساندنی مرۆڤەکانی ڕۆژگاری خۆی، حەیا لە لای مرۆڤ بەشێکە لە حورمەت و ئیرادەی مرۆڤ بۆ ژیان و بوون، شاعیر لە سەرەتای شیعرەکەیەوە بە بوونی حەیا دەست دەکات بە ناساندن و شکستی ئەو کەسانەی کە هەموو حەیای خۆیان فڕێداوە و بوونەتە هۆکاری شکستی دەوروبەرەکەیشیان. ئەو ڕۆژگارەی کە ئیتر حەیا دەبێت بە دوو لەتەوە و بێحەیایی دەگاتە لوتکەی خۆی و کەسانی بەحەیاو پاکیش دەبنە کەسانی شکستخواردوو.

لەم شیعرەدا کۆمەڵێک چەمکی دژبەیەک بۆ مرۆڤایەتی خراوەتە ڕوو کە خۆی لەو چەمکانەدا دەبینێتەوە کە ئیتر ئەوە ئەو ململانێیە وای کردووە مرۆڤی ڕاستەقینە بوونی نەمێنێت و بە هەموو بەها جوانەکانیەوە لە ئاست بێحەیایی مرۆڤگەلێکی دڕندەدا شکست بخوات. مامەڵەی قانع لێرەدا دەبێتە مامەڵەیەکی وردی ئینسانی بۆ سەرکەوتن و شکستی ئینسانەکان لە ڕۆژگارە جۆر بەجۆرەکاندا. ئەو شکستانە بۆ مرۆڤایەتی لای قانع ئاوا دەردەکەوێت "کەسی بێ حەیا" دەبێت بە هۆکاری شکستی خواستەکانی گەلێک مرۆڤی بەحەیای تر لە مێژوودا.

کەندەڵان، کە دیارە لای قانع ئەمیش لە شیعرەکەدا هەر ئاماژەیە بۆ کەسی خراپ، بەڵام شاعیر زیرەکانە ئەو وێنانە لە سروشتەوە دێنێت دەیانگوێزێتەوە بۆ وێنەی ناو شیعرەکەی. کەندەڵان دەکات بە وێنەی سەرکەوتوو بۆ شکستی چیای سەرکەش، لە دیدیی قانعەوە کاتێک کە ڕۆژگار ڕووی خۆی دەگۆڕێت ئیتر هەموو شتە خراپەکان هەموو شتە ناجۆرو ناشیرینەکان دەبنە حاکمی هەموو بەها جوان و پیرۆزەکان.

قانع ئەوەندە بێزارە لە ڕۆژگارو تەمەنی خۆی، بەدەست کەسە هەلپەرست و نامۆکانەوە، بەدەست ئەو مرۆڤانەی ژیانیان لە خەڵک کردووە بە دۆزەخ، لە شوێنێکی دیکەدا داوا دەکات کە ئیتر سروشتیش چۆڵ بکرێ بۆ دڕک داڵ و گژوگیا، گوڵ سەر نەهێنێتە دەرەوە لە خاک. هەموو ئەو وێنانەی قانع لەم شیعرەدا دەیانخاتە ڕوو هەموویان پەیوەندییان بە ڕۆحی سەرگەردانیی مرۆڤەوە هەیە بۆ ژیان، بەڵام قانع لە ژێر ناوی ئەو وێنانەدا



ڕۆحی مرۆڤایەتی دەخاتە ڕوو:

گوڵ ئەگەر ئەقڵی ببێ، قەت سەر لە خاک ناکاتە دەر
چونکە ڕۆژی دڕک و داڵە و گەرمی بازاڕی گیا

بانگەوازی قانع و داواکارییەکانی، لێرەدا دەبێتە ئەو بانگەوازەی کە ئیتر هەموو شوێنێک بۆ مرۆڤی باش حەرام کراوە و ڕۆژگاری ئەو کەسانەیە کە سەرسەختانە بەر بە ویست و داخوازیی مرۆڤایەتی دەگرن. قانع ئەوەندە ژیانی پڕ بووە لە بەدبەختی و ڕەشبینی، داوا دەکات کە چیتر لە گەرمەی بازاڕی ناخۆشیدا جوانییەکان سەر نەهێننە دەر، چونکە ناتوانن درێژە بە بوونی خۆیان بدەن. ئەو شەڕەی قانع لێرەدا بە گوڵ و دڕکی دەکات و وێنەیان دەخاتە ڕوو، شەڕێکە لە شەڕی ئەو ئینسانانەی کە ئەوەتی ژیان هەیە، خەریکی پێدادانی یەکترین و زۆرکاتیش ئیتر بەدبەختییەکە بۆ ئینسانە باش و چاکەخوازەکان بووە، شکستیان خواردووە و ڕۆژگار بووەتە ڕۆژگاری دڕک و داڵ و مرۆڤە دڕندەکان.

با، لە هەورا سەرنیگون بن مانگ یا ڕۆژی جوان
شەمشەمە کوێرە ئەڵێ: من نامەوێ شوعلەی چیا

مامەڵەکردنی ئەم دەقە شیعرییە مامەڵەکردنێکە کە قانع تێیدا پێ لەسەر هاتنە سەر کاری ئەو مرۆڤانە دادەگرێت کە هەموو ویستیان بۆ پاوانکردن و چەوساندنەوەی بەرامبەرەکەیانە بە هەموو نەزانی و بێ ئەقڵی و بێحورمەتیی خۆیانەوە. هەوڵی شاعیر خستنەڕوو و هێنانەکایەی ئەو گەمە تۆقێنەرانەیە کە تێیدا ئیتر ڕووناکی و جوانی تێدا ماڵئاواییان لێ دەکرێت و شەمشەمە کوێرەکان دەبنە وێنەی سەردەمە جۆربەجۆرەکان و ئەوان ناو لە شتەکان دەنێن. قانعیش ڕاستگۆیانە لە وێنەی ڕۆژگاری خۆیەوە وێنەی ڕۆژگارەکانی تریشمان بۆ وێنە دەکێشێت کاتێک خوێنەر لەم وێنانەی تری ناو دەقە شیعرییەکە ڕادەمێنێت، دەزانێت شاعیر چەند خێرا بە گژ فەلەک و دەرکەوتە نامۆکانی



دەوروبەریدا دەچێتەوە:

ئەی فەلەک! ڕاستۆ نەبی، بۆ ڕێک و پێکیی دەورەکەت
گورگ ئەبێتە شوانی ڕان و دز ئەبێتە ئەولیا

ئەم ناونانە بۆ فەلەک و هاتنە کایەی ڕۆژگارێکی ڕەش لە ڕۆژگاری قانعدا، درککردنی ئەو تاوان و دڕندایەتیانەیە کە مرۆڤ ئیتر ناتوانێت پێشبینیی هیچ ڕووداوێکی باش بکات بۆ تەمەن و ڕۆژەکانی خۆی. شاعیر وێنەی هاتنەکایەی دەورانێکی خراپ و شکستخواردوو وێنە دەکێشێت، وێنەیەک کە لای قانع سەدان خوێندنەوە هەڵدەگرێت و هەر خۆی بانگەشە بۆ ئەو جیاوازییە گەورانە دەکات کە کەوتوونەتە نێوان مرۆڤەکانەوە. سوڕانی گەردوون دەبێت بە سووڕانێکی کوشندە بۆ زۆر کەس و بۆ هەندێک کەسیش دەبێت بە دەورانێکی بەخشندە.

لای شاعیر ئەو دەورانە بەجۆرێک دێت کە ئیتر وێنەکان بۆ ژیان گۆڕانێکی ئەوەندە قورسیان بەسەردا دێت تا ئاستی ئەو ناونانەی کە وێنەیەکمان بۆ دەکێشێت تیایدا گورگ دەبێت بە شوانی ڕان. ئەو وێنەی کە قانع لەم شیعرەدا لە وێنە و ناوهێنانی گورگەوە بۆ مرۆڤی دەکێشێت، وێنەی ئەو مرۆڤانەیە کە سوڕانی فەلەک چۆن چۆنی دەیانکات بە زاناو و دەسەڵاتدار بەسەر گیانی کەسانی نائومێدو بەدبەختەی ترەوە.

قانع ئەو ڕۆژگارەی خۆی لەو شێوەیەدا جێگە دەکاتەوە کە ئیتر گورگەمرۆڤ دەبنە شوانی ئەو مرۆڤە نەبوو و بەشخوراوانەی کە نیگایان بۆ هەموو شتەکان لێ زەوت دەکرێ. لای قانع ئیتر پێناسەک بۆ ئامادەبوونی مرۆڤی باش نەماوە. ئەو ناونیشانەی ئەو دای دەنێت جەستەی دزەکانە کە ئیتر خۆیان وەکو ئەولیا دەناسێنن و ڕۆژگار دەبێت بە ڕۆژگاری ئەوان و جیهانێک دەخولقێنن کە مرۆڤ لە جیاتی ئومێد و خواستەکانی تەمەنای مردن بکات.

ئەم دوو بەیتە شیعرەی ناو شیعرەکەی قانع لە ڕووی ماناو و لێکدانەوەوە بۆ ئەو ڕۆژگارەی شاعیری تێدا ژیاوەو بۆ ڕۆژگارەکانی تریش،

دوو بەیتە شیعرن، کە زۆر زەحمەتە ئەوانەی دەیخوێننەوە بتوانن وا زوو لێی دابرێن و مانای جیاجیای بۆ نەدۆزنەوە. ئاخر خۆ شیعری باش، گرنگی لە کێشانی ئەو وێنانەدایە کە شاعیر لە شیعرەکانیدا دەیان کێشێت و درێژ دەبنەوە بۆ ڕۆژگارو لای خوێنەرە جیاجیاکان بە تێرامان و خوێندنەوەی جیاوە دەبینرێ. قانع لە شیعرەکەیدا درێژە بەو ڕۆحیەت و ستەمی ئەو ڕۆژگارەی خۆی دەدات و ئاوا جیاوازیەکان لە نێوان مرۆڤەکاندا دەخاتە ڕوو:

نێرە گاجووتێ ئەبەیتە ڕیزی لوقمانی حەکیم
فەیلەسووفێکیش ئەخەیتە ژێر چەپۆکی ئەشقیا

ئەو تێگەیشتنەی قانع بۆ ڕۆژگار هەیەتی، تێگەیشتنێکی زیرەکانەو قووڵە بۆ سەرکەوتن و شکستی مرۆڤە جیاجیاکان بە دوو ئاراستەی تەواو پێچەوانە. لە پێکهاتەی ڕۆژگارە پێکەنیناویەکاندا وێنەکان لای بیرمەندان و کەسە تێگەیشتووەکان کە قانع زۆرباش درکیان پێ دەکات، چەند پێکەنیناوییانە شتەکان تێکەڵ بە یەکتری دەبن. ئەو پرسیارانەی کە بۆچی هەمیشە ئاوەژووی شتەکان دەکرێن؟ تا بە وەڵامێکی گونجاو بگەن لای قانع ئاوا لە وێنەی شیعرەکەیدا وەڵام دەدرێتەوە: کەسە نەزان و بەدخووەکان، گێل و نەفامەکان دەگەیەندرێنە جێگەی کەسە زاناو ڕۆشنبیرەکان. بە دیوەکەی تریشدا کەسە باش و لێهاتووەکان دەکرێنە قوربانی بۆ ئەو مرۆڤانەی قانع لە وێنەی گادا ناویان دەهێنێت. ئامانج و ویستی کەسە زاناو خوێندەوارەکانیش دەخرێنە ژێر چەپۆکی کەسە دڕندەو نەزانەکانەوە.

کارکردنی قانع لەسەر ئەم جۆرە وێنانەی ناو کۆمەڵگا، لە ڕۆژگارە جۆر بە جۆرەکاندا پەیوەندی بەو ئیرادەیەوە هەیە کە هەمیشە بە ئیرادەیەکی خراپ بەڕێوە دەچێت و دەرگا لەسەر کەسە خراپ و خۆویست و دڕندەکان دەکرێتەوەو ئیرادەیان زاڵ دەکرێ بەسەر ئیرادەی سەدان کەسی بیرمەندو باشدا کە ویستیان ویستێکی مرۆڤدۆستانەیە. لە هەناوی هەموو ڕژێمێکی خراپیشدا دەرگا لەسەر خواستی مرۆڤە باش و جدییەکان داخراون و لە جێگەیان کەسانی گێل و ناشایستە دانراون.

ئەم جۆرە مامەڵەکردنەی قانع بۆ وێنەی مرۆڤەکان وتێکەڵکردنیان بە دەقێکی شیعری، واتایەکە بۆ خوێندنەوەی جەستەی ئەو کەسانەی هەموو جۆرە خراپەیەک پەیڕەودەکەن بۆ سەرکەوتنی ویستی خۆیان. قانع دواتر لە کۆتایی شیعرەکەیدا وێنەو ماناکان زیاتر تێک هەڵکێش دەکات و دەقێک دەنووسێت کە خوێنەر هەمیشە هەست دەکات ئەو وێنانەی شاعیر لێیان دەدوێت بە هەموو مانایەکەوە لە دەوروبەری خۆیدا بوونیان هەیە. ئاوا لەم دوو نیوە دێڕەی کۆتایدا قانع وێنەیەکمان بۆ دەکێشێت کە وەڵام دانەوەیەکە بۆ دەردە بێکۆتاییەکان:

تۆ بە مێرووڵەی زەعیف ئیشی سلێمانی ئەکەی
خاتەمی مۆری نگینت کردە دەست دێوی هەیا

شاعیر لە کۆی کارەکانی مرۆڤی لاواز و بێئیرادە کە خۆی لە هەموو نائومێدی و خراپەیەکدا لە ڕۆژگارە جیا جیاکاندا بۆ مرۆڤایەتی دەردەخات. ئیتر لەو ڕۆژگارانەدا و لەسەر دەستی ئەو جۆرە مرۆڤانەدا، کە بە هەموو پێوەرێک هیچ نین، جگە لە کەسانێکی خراپ، نابێت چاوەڕوانی هیچی تر بکەین جگە لەو ناخۆشیانەی هەمانە و بە دەستیانەوە گیرۆدەبووین.

ئەوەی قانع لەم شیعرەدا ئاشکرای دەکات، بوونی ئەو مرۆڤانەیە کە کەوتوونەتە نێوان مەرگ و حاکمیەتی مرۆڤە گێل و نەزانەکانەوە، کۆی شیعرەکەی قانع، کۆی ئەو وێنانەیە کە خۆی لە ناونیشانی ئازار و خراپەکاریدا بۆ مرۆڤ وێنا دەکات. قانع لەم شیعرەدا مەرگی کۆمەڵگا ئاشکرادەکات و لەسەر ئەم جۆرە مەرگە ناونیشانی ئەو خراپەکارییانەمان بۆ دەکێشت و ڕەخنە لەو ڕۆژگارانەش دەگرێت کە هەموو مەینەتییەکانی لەسەر جەستەی بەشێکی زۆری کۆمەڵگا کەڵەکە کردووە و مرۆڤی لاواز و گورگئاسا دەکات بە حاکمی برین و هەموو نەبوونییەکانیان.

*– دیوانی قانع لاپەڕە 68






# چەند سەرگورشتەیەکی شاعیر

## ئا: ڕۆڤار

قانع ڕووخۆش و نوکتە پەزێر و قسە لەڕوو بووە، لە هەر کۆڕو کۆمەڵ و کۆبوونەوەیەکدا بەشداریکردبێت بە زوویی دەرکەوتووە و ناسراوە، کردەوەکانی و قسەکانی سەرنجراکێشەر بوون... ئێستا لەم بەشەدا هەندێک بەسەرهاتی بچووکی باسدەکەین کە پەیوەندییان بە واقیعی ژیانیەوە هەیە:

– قانع منداڵ دەبێ و بێ دایک و باوک، شەوانە لەسەر تەنووران ڕۆژی دەکردەوە لەگەڵ کۆمەڵێک منداڵی وەک خۆی لە کۆڵانێکدا لەدێی دۆڵاش کە نیشتەجێی باب و باپیری دەبێ، یاریدەکات (ئاغا سەیید حسەینی) خەڵکی "چۆڕ" بەوێدا بە سواریی دەڕوات و ئەسپەکەی پێ بەخانووچکەی منداڵەکاندا دەنێ و دەیڕوخێنێ. قانع دەستدەکا بە گریان. پیاوێکی بەساڵاچوو کە لەبن دیوارەکەدا دانیشتوو دەبێ بە ئاغا سەیید حسەین دەڵێ: ئەو منداڵەی ئەگری کوڕی شێخ قادری شێخ سەعیدی دۆڵاشە... ئاغا سەیید حسەین دادەچڵەکێ و دەڵێ بۆچی بەم شێوەیە وەکو بێکەسێک دەژی... پیاوە پیرەکە دەڵێ: پاش لێقەومانیان بە دەست دەرەبەگەکانەوە، ڕایانکردە بناری شارەزوور، کەشێخ قادر ئەمری خوای کرد ئەمیش بە

بێکەسی هێنایانەوە بۆ دۆلاش و مامەکانیشی نازی ناکێشن... ئەویش دەڵێ: بەرزیکەرەوە و بیدە دەستم... لە کابرای وەردەگرێ و بە سواریی دەیباتەوە بۆ دێی "چۆڕ" هەر لەناوچەی مەریوان... ئنجا قانع خۆی دەیگێڕایەوە و دەیووت: لەبیرم دێ ئاغا سەیید حسەین بە دەستی خۆی بەئاو و سابوون لەناو تەشتێکدا شۆردمی و دەستێ جلی تازەی منداڵانەیان بۆ هێنام، کردمە بەر و زۆری پێ نەچوو لای مەلای قوتابخانە دایاننام. ئەمە بوو بە سەرەتای فەقێیەتی و خوێندەواریم و تەنانەت لە شیعرێکدا وتوویە:

هەزار ڕەحمەت لە ئارامگاهی بەرزی سەییدی (چۆڕ)ی
کە منداڵبووم بە لوتفی خۆی مەساری ژینمی گۆڕی

– لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا دۆستایەتییەکی زۆر بەتینیان دەبێ، لە سەرەتای شەستەکاندا دەبێ، فەقێ تایەر ناوێکی خزمی قانع دێت بۆ لای و داوای لێدەکات نامەیەک بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریم بنووسێ بەڵکو لە حوجرەکەی مزگەوتی گەیلانی لە بەغدا وەریبگرن و بخوێنێ... ئەویش ئەم چوارینە شیعرە فارسییەی سەعدی وەکو لای خوارەوە دەگۆڕی و بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی دەنێرێ:

ای کریم که از خزانەی عیلم
گبر و ترسا وظیفە خورداری
ظاهر ما کجا کنی محروم
تو که با یابەها نظرداری

– ڕۆژێکیان ڕێی دەکەوێتە تەکیەی شێخێک لە ناوچەی شلێر، لەو کاتەدا شەکرو چایی دەگمەن دەبێ شێخە بە قانع دەڵێ بە زمانی ئێمەوە قاقەزێک بۆ (خان) بنووسە لە دارۆخان، بەڵکو نەختێک شەکر و چای بۆ تەکیە بنێرێ... ئەمیش ئەم چوارینە شیعرەی سەعدی هەر بە فارسی دەگۆڕێتە سەر باسەکەی خۆیان.

روی بردار و خان و می گویم
هر سحرگاه که باد می آید
ای که صندوق قند و چای داری
هیچت از بندە یاد می آید..

– ماڵی لەدێی کەوڵۆس دەبێ، دەچێ بۆ دیدەنی مەلایەکی برادەری بۆ هەوار موبارەکی لێکردنی، تەنیا سەگێکی دەبێ بەدیاری دەیبات بۆ مەلاکەی هاوڕێی... هاوڕێکەی زۆر سەری سوڕ دەمێنێ و لێی دەپرسێ: ئەم سەگەت بۆچی هێناوە؟ ئەویش دەڵێ: لەبەر دوو هۆ، یەکەم هیچ نەبوو بە دیاری بۆت بێنم و دووەمیش ئەم سەگە نان دەخوات منیش نانم نییە بیدەمێ.

– بەڕێبواری ڕێی دەکەوێتە دێیەک، زستان دەبێ. شەو لە مزگەوتی دێکە دەمێنێتەوە، گەلێک گوێ لەقسەی دانیشتوانی مزگەوتەکە دەگرێ... مەلای دێکە قسە بۆ خەڵک دەکات و دەڵێ: هەر کەس بە ئانقسەت چڵەپووشێک لەسەر خەرمانی یەکێکی تر هەڵبگرێ، یان بە بێ پرسی خاوەنەکەی بیکات بەژێر ددانیا، لە قیامەتدا حەفتا هەزار ساڵ لە ئاگردا دەیسووتێنن... قانعیش خۆی پێ ناگیرێ دێتە وەڵام: مامۆستا لەسەر چڵێک پووش حەفتا هەزار ساڵ زۆرە.

– خزمێکی شاعیر کچێکی خۆی دەدات بە مەلای دێکەیان کە مەلاکە زۆر بەتەمەن گەورە دەبێ... قانع بە خزمەکەی دەڵێ: بۆچی ئەمەت کرد؟ ئەویش دەڵێ: لەبەرئەوەی کوڕەکەم بکات بە خۆی، واتا (کوڕەکەم وەکو خۆی فێری خوێندەواری بکا) ئەمیش دەڵێ: پەلەت نەکردایە هەر کات کوڕەکەت گەورە بوو دەبوو بەخۆی!! واتا دەبوو بە مەلاکە... (بەم مانایە گوایە جیاوازی نێوان کوڕە



نەخوێندەوارەکە و مەلاکە تەنیا گەورەیی تەمەنە).

– کۆمەڵێک لە دۆست و برادەرانی قانع پێی دەڵێن دوکانداری بکات ئەویش دەڵێ: (ئەگەر خوا بزانێ دوکانی کڵاو فرۆشتنم هەیە ئادەمیزاد بە بێسەر دروستدەکات.)

– مەلای دێی "نەوێ" دەبێت لە بناری شارەزوور، لەوکاتەدا هەر کەس بەرازێکی بکوشتایە گوێچکەکانی بۆ بەڵگەی ڕاستی ببردایە بۆ لای مدیری ناحیە، بەرامبەر بە گوێچکەی هەر بەرازێک چارەکە دینارکی وەردەگرت... ئەویش ڕۆژێکیان دەچێ بۆ لای ناوچەداری (مدیری ناحیە)ی خورماڵ لە شارەزوور، چەند گوێچکە بەرازێک لەناو دەسرێکدا لەسەر مێزەکەی دادەنێ و مدیریش تەماشایەکی سەرو سیمای دەکات، کە مێزەری سپی و پشتێنی سەوز – کە نیشانەی شێخیەتیە – دەبینێ، سەری سوڕ دەمێنێ کە چۆن ئەم مەلایە دەست لە گوێچکە بەرازەوە دەدات، کە بەپێی فەرمانی شەریعەتی ئیسلام گڵاوە؟! لێی دەپرسێ: ئەمە چییە؟ ئەویش دەڵێ: ئەمانە گوێچکە بەرازن، هێناومن بۆ ئێوە پارەکەم بدەنێ. مدیرەکە پێی دەڵێ: تۆ مەلای و شێخیشی چۆن ڕاوە بەرازت کردووە و بەرازت کوشتووە؟ قانعیش پێی دەڵێ: قوربان خۆم ڕاوم نەکردوون... من مەلای دێکەم خەڵکی ئاوایی ڕاویان کردووە ئەو گوێچکە گەورەیان لە جیاتی سەرفترە وەرمگرتووە، ئەو ناونجییەیان لە جیاتی سەرقەڵەمدانەی دوعا و ئەو بچووکەشیان مردوو شۆرانەیە... مدیرەکە دەمودەس دەزانێ ئەمە هەبێ و نەبێ قانعی شاعیرە.




– نەخۆش دەبێ لە خەستەخانە، دوکتۆر پێی دەڵێ: نابێ بە هیچ جۆرێ جگەرە بکێشی. چەند جارێک دکتۆر سەری لێدەدا هەموو جار دەیبینێ هەر خەریکی جگەرە خواردنە، ئینجا دوکتۆرەکەی پێی دەڵێ: مامۆستا تکات لێ دەکەم وەکو ناتوانی جگەرە نەخۆیت بۆ ئەوەی زیان بە تەندروستیت نەگات کە دووکەڵەکە هەڵدەمژیتە ناو دەمت، قووتی مەدە لە دەمتەوە بیکەوە دەرەوە، ئەویش بە دکتۆرەکە دەڵێ منیش تکایەکم هەیە جەنابیشت کە نان دەخۆی دوای ئەوەی کە پارووەکەت بەتەواوی جوو قووتی مەدە، تفیکەوە.

– بۆ ئەوەی ئەو لایەنە خورافیانەی تێکەڵ بە ئاینی ئیسلام بوون کە میانبکاتەوە ڕۆژێکیان لە دێیەکی مەریوانەوە دەچێ بۆ دێیەکی ترو سواری گایەک دەبێ، چەند جارێک دەکەوێتە خوارەوە، کە نزیک ئاوایی دەبێتەوە دەیناسن، دەچن بەرەو پیریەوە و پێی دەڵێن: مامۆستا بۆچی ڕاتنەسپارد و وڵاخێکت بۆ بنێرین سواری ببی و ئیتر ئەوەندە لە سواری ئەم گایە نەکەویتە خوارەوە، ئەویش دەڵێ:مەبەست ئەوە نیە بەسواری بێم، یان نە! بەڵام ئاخۆ ئەم گایە لەم دنیایەدا و لەم ئاوایی خۆمانە و لەم ڕێگا پان و پۆڕەدا ئەمە حاڵی بێ. ئاخۆ سبەینێ لەسەر پردی (سیرات) چی بکات؟

– ساڵی (1956) دەچێ بۆ دەربەندیخان، لەو کاتەدا چەند کۆمپانییەک خەریکی بەستەکەی دەربەندیخان دەبن، مامۆستا (کەریم زەندی) هاوڕێی لەوکاتەدا ئەفسەری کارو گوزار و پەیوەندی یەکێک لە کۆمپانیاکان دەبێ ئەمیش لە پارچە قاقەزێکی بچکۆلەدا تەنیا ئەم ڕستەیەی بۆ دەنووسێ:
(یا کەریمی کارسازی مەدەدێ)...
مامۆستا زەندی دەمودەس بۆ لای و تێدەگات بە شوێن ئیشدا دەگەڕێ، دەیکات بە پاسەوانی بڵدۆزەرێکی شکاو بە ڕۆژانەیەکی باش.
– قانع لە دێیەک مەلا دەبێ و کۆمەڵێک کۆلکە فەقێی دەبێ، ڕۆژێکیان فەقێکانی پێی دەڵێن

دوعای دەمبەستی گورگمان فێرکە. ئەمیش ئەم دوو دێڕە شیعرەیان پێڕەوان دەکا:

ئادانە، دانە، دانە گورگیش سەگی گەردانە
بە گالۆک و بە گۆچان دەم گورگ بەسین لە حەیوان

فەقێکان ئەمە لای خەڵکی ئاوایی ئاشکرا دەکەن و خەڵکەکە لەسەر ئەمە لێی زویر دەبن، گوایە گاڵتەی بەدوعای (دوەم بەستی گورگ) کردووە.

– برادەرێکی بەتەڵاق سوێند دەخوات، پێی دەڵێ: تۆ هەرگیز نابیتە خاوەنی دوو دینار پارەی خۆت، ماوەیەکی بە سەردا تێدەپەڕێ ڕۆژێکیان لە ئوتومۆبێلێکدا بەناو بازاڕە بچکۆلەکەی سەیدسادقدا تێدەپەڕن، چوار دیناری پێدەبێ لە ناکاو چاوی بە کوڕی برادەرەکەی دەکەوێ، بە شۆفێرەکە دەڵێ: زەحمەت نەبێ نەختێک لێردەدا ڕاوەستە. بانگ لە کوڕی برادەرەکەی دەکات، پارەکە لە گیرفانی دەردێنێ و دەڵێ:
سڵاوم بە باوکت بگەیەنە و پێی بڵێ تەقەڵاقەکەی کەوت چونکە ئەم چوار دینارە هینی خۆمە.

– فەقێ دەبێ و سەرەتای شاعیریەتی دەبێ و تازە (قانع) ناو بانگی پەیدا کرد بوو، دەچێتە دێ (سادەوا) لە مەریوان، تەمەشا دەکا حوجرەی فەقێکان چۆڵە. لە یەکێک دەپرسێ فەقێکانی ئەم دێیە لە کوێن؟ کابرا پێی دەڵێ قانعی شاعیر هاتووە لە ماڵی ئاغا میوانە و هەموو فەقێکانیش بەو بۆنەیەوە بانگکراون بۆ دیوەخان... ئەمیش لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئاخۆ ئەم قانعی شاعیرە کێبێ؟! ئەویش دەچێ بۆ دیوەخان بۆ بینینی (قانعەکە) کە دەچێتە ژوورەوە سڵاو دەکا تەماشا دەکا فەقێیەک لای ژووری هەمووانەوە لەسەر دۆشەکێک دانیشتووە و ئەنیشکی لەسەر سەرینایەک داداوە و ئاغای دێکەش لە تەنیشتیەوە لەسەر چۆک دانیشتووە، فەقێکانی ئاوایی و دەست و پێوەندە نزیکەکانی ئاغاش بەڕیز دانیشتوون، هەر کە دەچێتە ژوورەوە و ئەمە دەبینێ فەقێی خۆ بە قانع ناونراو دەناسێتەوە. ئەمیش دوای سڵاو کردن پەلاماری دەستی فەقێکە دەدات و دەستی دەگوشێ و پێی دەڵێ: مامۆستا قانع بەخێر بێیت، زۆر تامەزرۆی چاو پێکەوتنت بووم. فەقێکەش قانع دەناسێتەوە لە هەوەڵەوە ڕەنگی تێکدەچێ، بەڵام کە قانع بەو جۆرە دەست و ماچی لەگەڵ دەکات فەقێکە دێتە سەرخۆی، لە لاشانی خۆیەوە دایدەنێ و دەڵێ ئەم فەقێیە زۆر دۆستمە و دەمێکە نەمدیوە حەز دەکەم لەلای خۆمەوە دابنیشێ... قانعیش دەڵێ: ئەم ماۆستا قانعە ئێستا میوانی ئێوەیە ماوەیەک مامۆستام بووە و دەرسی پێ وتووم. خەڵک داوا دەکەن شیعریان بۆ بخوێنێتەوە. ئەویش تاک و تەرا شیعری ئەم و ئەو دەزانێ و تێکەڵیان دەکات... قانعیش پێی دەڵێ: مامۆستا قانع ئەگەر ئیجازە بفەرمووی شیعرەکانی ئەو ساڵەی بە دەرس پێت وتم هەموویم لەبەر کردوون، با بیانخوێنمەوە بۆ دانیشتووان. ئەویش دەڵێ: فەرموو... قانع چەند پارچە شیعرێک دەخوێنێتەوە و کوڕەکە گەرمدەکات. دوای نانخواردن دەیانەوێ بڕۆن، ئاغا وڵاخێک بۆ میوانە بەناو قانعەکە زیندەکات و خزمەتکارێکیان دەخاتە گەڵ، کە لە ئاوایی دەرچوون میوانی بەناو قانع دەڵێ: دەبێ تۆ سواری ئەم وڵاخە بیت، چونکە بۆ قانع زینکراوە. ئەویش دەڵێ کەوابوو با وڵاخەکە بگەڕێتەوە و هەردووکمان بەپێ بڕۆین و بەسەر بەستی قسە بکەین.

– ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێیەکیدا ڕێیان دەکەوێتە ئاوایی گۆخلان لەناوچەی شلێری پێنجوێن، کەواو سەڵتەی لەبەردا دەبێ و مێزەرەی سپی مەلایانە بەسەرەوە دەبێ، کە دەچنە هەیوانی مزگەوتەکە خەڵکی ئاوایی، ئەوەندەی کە لەوێ دەبن زۆریان پێ ناخۆشدەبێ، وا دەزانن ئاغای دێکەیان ناردوویەتی بەزۆر ببێ بە مەلایان و ئەرک بکەوێتە سەریان... قانع لە ساردیی خوڵکی خەڵکەکە تێدەگات و



پێیان دەڵێ: برایینە بۆ ئەوە نەهاتووم کە ببم بە مەلاتان، ڕێبوارم، بەڵام زۆر ماندووم ئەوەمەێ گوێدرێژێکم بۆ پەیدا بکەن. لەو کاتەدا خەڵکەکە خەریکی پەیدا کردنی گوێدرێژەکە بوون، ئەویش ڕوو دەکاتە هاوڕێکەی و ئەم نیوە شیعرە دەڵێ: (چاوەڕوانیی لوتفی کەر کەین تا دەگەینە ئارەزوو)

– لەکاتی یەکەمین شەڕی جیهانیدا فەقێ دەبێ لە ناوچەی مەریوان و خەڵکێکی زۆر بەناوی ئاینەوە دژی لەشکری ڕووسیای قەیسەری چەک هەڵدەگرن و داکۆکی لەسەر لەشکری عوسمانیەکان دەکەن، کۆمەڵێ مەلاو فەقێیانیش بارەگایەکی تایبەتییان دەبێ لە چیایەکدا دەبن، زستان دەبێ، ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە و شەو بە دەوری ئاگرەکەدا ڕادەکشێن: لە نیوەشەودا تەقەی تفەنگ و پەلاماربردنی لەشکری ڕووس خەڵکەکە بە ئاگا دێنێتەوە. قانعیش لەنزیک ئاگرەکەوە خەوتبوو، پێڵاوەکانی نیوە سووتاو دەبن، کە تینی ئاگرەکە دەگاتە لاقی، بەئاگا دێتەوە لەبەر ئازاری قاچی بێپەروا بەرەو بناری چیاکە – واتە ڕووبەڕوی لەشکری ڕوسەکان – ڕادەکات بەو نیازە کانی و ئاوێک دەبێ، خۆی بخاتە ناوی و قاچەکانی سارد بێتەوە. کە خەڵکەکە ئەمە دەبینیی، وا دەزانن بۆ سەر لەشکری ڕووس پەلامار دەبات... بە جارێک دەستدەکەن بە سەڵەواتلێدان و شوێنی دەکەون. لەشکری ڕووس کە ئەم هێرشە ڕووبەڕووە دەبینێ ناچار دەکشێتە دواوە، بۆ سبەینێ سەرکردەی عوسمانییەکان دەبیستێ کە فەقێیەک بۆتە هۆی شکاندنی لەشکری ڕووسەکە... بانگیدەکات و گوایە لەسەر ئەو ئازایەتییە خەڵاتیدەکا.



– لە دێیەک ئاشەوان دەبێ، شەوێک کار گوزارێکی سیاسی ڕێی دەکەوێتەماڵیان. تاکو نیوەشەو دادەنیشن و باسی چەندان جۆر بابەت و مەسەلەی نیشتمانی دەکەن... لەکاتی خەوتندا کارگوزارەکە پیی دەڵێ: مامۆستا قسەکانتم زۆر پێخۆش بوون، بەقسەکانتدا دیارە لایەنگری کۆمەڵەکانی... ئەمیش پێی دەڵێ: کاکی برام وا دیارە لە ئێوارەوە لە قسەکانم تێنەگەیشتوویت، چوونکە قسەکانی من ئەوە ناگەیەنن لایەنگری ئێوە بم بەڵکو ئەوە نیشان دەدەن کە ئێوە لایەنگری من بن.

– خاوەن ملکێک قانعی زۆر خۆشدەویست چەند جارێک پێی دەڵێ حەز دەکەم پارچە زەوییەکەت بۆ تاپۆ بکەم، قانع بە گەرم بە دەم داخوازییەکەوە ناچێ. ڕۆژێکیان خاوەن ملکەکە پێی دەڵێ: پێم ناڵێی بۆچی من ئەوەندە حەز دەکەم پارچە زەوییەکەت پێببەخشم تۆ ناتەوێت؟ ئەویش پێی دەڵێ: من نامەوێ لەبەر خاتری پارچە زەوییەکە ببم بە (موستەعمەرە)ی قسەکانت.

– جارێکیان لای شێخە ئیرشادێک دادەنیشێ و لە دڵەوە بەینیان ناکۆک دەبێ. لەو کاتەدا کابرایەک بە هەڵەداوان خۆی دەکات بەژوورەکەداو دەستی شێخ ماچدەکات و دەڵێ: قوربان کوڕەکەم مار پێوەی داوە، پاروویەکی دەمەجووی خۆتم بدەیتێ بیخەینە سەر جێی گەستنی مارەکە، بەڵکو لە بەرەکەتی جەنابتانەوە چاک بێتەوە... بەرلەوەی شێخ قسە بکا قانع بە کابرا دەڵێ: نانت هێناوە شێخ بۆت بجووی؟! کابرا دەڵێ نەخەیر.. ئەمیش دەڵێ: سەیرە، هەر یەکێک مار بیخوات و شێخ پارووپەک نانی خۆی بۆ بجوێ و بیداتێ چۆن دەریدینێ... ئەمە لەشێخەوە دوورە نانی خۆیت بۆ بجووێ برۆ نانی خۆت بێنە.. شێخەکە بەمە ئەمەندەی تر دڵگیر دەبێ و داوای ئاشتبوونەوە لە قانع دەکات.

– جارێکیان لە خانەقای شێخێک دادەنیشێ،

کۆمەڵێک سۆفی و مورید دەورە لە شێخ دەدەن، شێخ ڕوو دەکاتە یەکێک لە سۆفییەکان و دەڵێ: "دایکە هاڵیان مەنەن" واتە دایکە هاڵیان ماوە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ... خەڵکەکە بێدەنگدبن و شێخ دەڵێ جنۆکەیەکمان هەیە مێردەکەی مردووە، لە هەوارگەی ئەم سۆفیەدا کەپرێکی غەیبی بۆ خۆی دروست کردوە... قانع ماوەیەک دەنگ ناکا، دوایی ڕوو دەکاتە هەمان سۆفی و دەڵێ: (ئەجیل زارەبین مەنەن) واتە ئەجیل زارەبین ماوە؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ. ئینجا قانع بە شێخ دەڵێت پێت بڵێم ئەجیل زارەبین چییە؟ شێخ دەڵێ: بەڵێ. قانع دەڵێ: جنۆکەیەکمان هەیە ژنەکەی مردووە لەناو باخی ئەم سۆفیەدا، ڕۆژێک خانووی غەیبی بۆ خۆی کردۆتەوە... ئینجا منیش بۆ ئەوە هاتووم بۆ خزمەتتان بەڵکو ئیجازە بفەرمووی دایکە هاڵیان لای جەنابتانی لێ مارە بکەین و هەردوو لایان ڕزگاریان بێت... شێخ بە شەرمەوە سەری دادەخات... دوای نەختێک دەچێتە دەرەوە...

– لە ماڵی ئاغایەک دەبێ، ئاغاکە تانجییەکی ئازای دەبێ و دەڵێ: قانع ئەم تانجییە زۆر سەیرە، لە ڕاکردندا زۆر ئازایە دەگاتە کەروێشک بەڵام نایگرێ... ئەوە چاری چییە؟ ئەمیش دەڵێ چاری ئاسانە، داوا بکە کەروێشکێکی زیندوو بگرن و لە بەرچاو تانجییەکە کولێرەیەک ببەستن بە ملیەوە و بەرەڵای کەن... ئینجا هەر کات چاوی بەهەر کەروێشکێک کەوت وا دەزانێ کولێرەیەکی بە گەردنەوە بەستراوە... بۆ کولێرەکە هەر دەیگرێ... ئاغا دەڕەنجێ بەڵام نایخاتە خۆ...

– فەقێ دەبێ لە مەریوان لەو سەردەمەدا پەیوەندەییەکی بە تین لەنێوان کۆمەڵێ مەلاو فەقێیان و دەرەبەگەکاندا دەبێ... دەرەبەگەکان ئامۆشۆی حوجرەی فەقێکان دەکەن و شەوانە بە یاریی گۆرەوییبازی و دامە و ڕیزکێن و ئەم جۆرە شتانە شەویان دەبردە سەر... ڕۆژێکیان لەسەر بابەتێک لەگەڵ یەکێک لە ئاغاکاندا دادەنیشێ و دامە دەکەن. لەکاتی یاریکردنەکەدا ئاغا وەکو بیەوێ گاڵتە بە قانع بکات پێی دەڵێ: (ئەو بەردە بخۆ!) واتە ئەو داشە ڕێزینە بخۆ... پێدەکەنێ... قانع تێدەگات، دوای یارییەکە تەختەی دامەکە لادەبات و پاش نەختێک دەڵێ: جەنابی (.....) خان با دامەکە بکەینەوە! ئەمجارە قانع لەجیاتی داشی چیلکە پشقلە بزن دادەنێ... هەرچەن ئاغا دەڵێ، یان چیلکە، یان شقارتە دابنێ... بەقسەی ناکا. کە دەستدەکەن بە یاریکردن قانع پێی دەڵێ: جەنابی خان زەحمەت نەبێ ئەو پشقلە بخۆ... ئاغاکە دەزانێ کە تۆڵەی خۆی لی کردەوە یارییەکە تێکدەدات.

– لە دێیەک ئاشەوان دەبێ، دێکە دوو ئاغای دەبێ، ڕۆژێکیان لای ئاشەکەی دەبێ فەرمانبەرێکی گەورەی ئەوکاتە لەگەڵ کۆمەڵە سوارێکدا بەوێدا تێدەپەڕن، نایناسن... فەرمانبەرەکە بانگیدەکا و دەڵێ: ئا وەرە ئاشەوان... ئەمیش دەچێتە پێشەوە پێی دەڵێ: تۆ پیاوی کێی؟ – مەبەستی فەرمانبەرەکە ئەوە دەبێ بزانێ ڕەعیەتی کام ئاغایە – ئەمیش دەڵێ پیاوی کەس نیم... دەڵێ چۆن پیاوی کەس نیت؟ دەڵێ باش! تەنیا پیاوی خۆمم... فەرمانبەرەکە توورە دەبێ و دەڵێ چۆن پیاوی خۆتی؟ ئەویش دەڵێ بۆچی جەنابت پیاوی خۆت نیت؟ منیش وەکو تۆ پیاوی خۆمم.. دوای چەند جارێک لێی دووبارە دەکاتەوە کە هەر بەم جۆرە وەڵامیدەداتەوە، ئینجا تێدەگات کە ئەمە قانعی ئاشەوانە... داوای لێبوردنی لێدەکات.

– ئاشێکی دەبێ چەند تابلۆیەکی جۆربەجۆری نووسیبوون، لە شوێنە جیاجیاکانی ئاشەکەدا هەڵیواسیبوون، وەکو لە دارتوویەکی نووسیبوو (جێگای کەر بەستنەوە).. لە دارێکی تری نوسیبوو (جێگای دانیشتن)... لەبەر هەیوانی ئاشەکەی نووسیبوو (جێگای باراشخستن)... بەم جۆرە... ڕۆژێکیان کۆمەڵێک ئاغاو بەگزادە و وردە کوێخا



و.. لەڕاوە کەروێشکەوە دێنەوە، لا دەدەنە ئاشەکەو ماندوو دەبن، دەیانەوێ ئیسراحەتێک بکەن. هەموویان بە کۆمەڵ دەچن لە سێبەری ئەو دارەدا دادەنیشن کە لێی نووسراوە (جێگای کەر بەستنەوە).. قانع کە ئەمە دەبینێ دەستدەکا بە پێکەنین و دەڵێ: وەجاخزادەکان! تەشریف بێننە سێبەری ئەم دارەی تر، ئەوە جێگای ئێوەو مانان نییە... ئینجا ئەوانیش تابلۆکە دەخوێننەوە و بەشەرمەوە دەسدەکەن بە پێکەنین.

– مەلای دێ یەک دەبێ لە بناری شارەزوور... خەڵکی ئاوایی هەموو ڕۆژێ لە مزگەوت داوای لێدەکەن (حدیث) یان بۆ بخوێنێتەوە... ئەمیش بێزار دەبێ، ڕۆژێکیان دەڵێ: ئیمامی باوکی پشیلە بەم جۆرەی وتووە: (واتا ابا هریرە ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە)... گووژاڵکی کوڕی ڕێوی، واتا (حنظلە بن ثعلب) قوڕاوی کوڕی شووتی (سیل بن حب حب)... بەم جۆرە ئەوانیش دەڵێن مامۆستا ئەم ناوانە چین؟ ئەویش ناوەکانیان پێدەڵێ، خەڵکەکە دڵیان لێی سارد دەبێتەوە و دەچن مەلایەکی تر دێنن.

– لەگەڵ خزمەکانی لە دێی (کەوڵۆس) لەسەر چەند وردە بابەتێکی ئاینی دەبێتە ناخۆشیان و دێی کەوڵۆس بەجێدێڵێ... لەپاش ماوەیەک مەلایەکی برادەری دێت بۆماڵیان و داوای لێدەکات قاقەزێکی بداتێ بۆ شێخەکانی کەڵۆس کە بیکەن بە مەلای خۆیان، ئەمیش قاقەزێکیان بۆ دەنووسێ، لە قاقەزەکەدا دەڵێ: بەو ناونیشانەی خۆمتان دەرکرد، ئەمە بکەن بە مەلای خۆتان... بە حسابی ئەم مامۆستایە کەرەکەی جەجاڵ گوێچکەکانی لێرەوە تا شام درێژن، ئەمە بۆ ئێوە زۆر بەکەڵکە.



– لە ساڵی (1954)دا، لە دەوروبەری هەڵبژاردنەکەدا لە پێنجوێن دەبێ. مدیر ناحیەیەک لە پێنجوێن دەبێ، چەند جارێک دەیگرێ و بەرەڵڵای دەکات... ڕۆژێکیان دەیەوێ بەسەفەر بچێ بۆ ناوچەی بەرزنجە، دەچێتە لای مدیر و پێی دەڵێ: جەنابی مدیر بەگ، دەمەوێ بە سەفەر بچم، هەفتەیەکم پێدەچێ، ئەگەر لەم هەفتەیەدا گرتنو مرتن هەیە ئەوا با نەڕۆم...

– لە ساڵی (1959)دا بە فیتی (...) ناوێک تێوە گلاو بە حەپسی بردیان بۆ عەمارە، ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە. مێخەکەیەک لە پێی دەرهاتبوو کە چەند جار بەتایبەتی چوو بۆ لای دوکتۆر چارەی بکا، چارەی نەدەکرا. لە بەندیخانە مێخەکەکە هەڵدەوەرێ. کە هاتەوە نامەیەکی سوپاسنامەی بۆ (...) نارد، زۆر سوپاسی تیا کرد بوو، نووسیبووی ئەگەر لوتفی جەنابت نەبوایە ئەو ئازار و مێخەکەیەم هەرگیز لە کۆڵ نەدەبوونەوە.

– لە پێنجوێن بە کاک عومەری حاجی عەبدوڵڵا، کە زۆر دۆستی دەبێ، وتبووی: فەردەیەک خەڵوزمان بۆ بکرە. چەند ڕۆژێکی پێدەچێ، کاک عومەر بۆی ڕێناکەوێ بیکڕێ. ڕۆژێکیان پێی دەڵێ: بۆچی خەڵوزەکەی ئێمەت لەبیر چۆتەوە؟ ئەویش دەڵێ: مامۆستا خۆ ئێوە هەمیشە نان و ترێ و تەماتەی کاڵ دەخۆن ئەمانە خەڵوزیان بۆ چیە؟

– کە لەبەندیخانەی تاران لەگەڵ وریای کوڕی بەردەبن، بەڕێکەوت ئەو ڕۆژە شەکراوی کوڕی شا دەبێ... هەر یەک لە حەپسییەکان پاکەتێک شیرینیان دەدەنێ، ئەمیش وەریناگرێ. ئەفسەری بەندیخانەکە توورە دەبێ و دەڵێ: ئەمە دیاریی شایە لە هەموو شتێک شیرینترە...

ئەویش دەڵێ: چەندە لای جەنابت شیرینە ئەوەندە لای من تاڵە.

– مەلا عەلی شمشێر کوڵ گێڕایەوە،

وتی: ساڵی (1954) لەگەڵ قانع لە بەندیخانەی سلێمانییەوە ناردینیان بۆ هەڵبجە. قانع بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە لە بەندیخانە ڕیشی تاشیبوو... لەناو ئۆتومبیلەکەدا دوو کابرای سۆفی ئێرانیش، کە سنوووریان شکاند بوو، بە حەپسی لەگەڵمان بوون و کەلەپچەیان لە دەستدا بوو... پۆلیسەکان کەلەبچەکانیان لە دەست سۆفییەکان کردنەوە، کردنیانە دەستی من و قانع... لەوێدا قانع دەڵێ: ڕیش تەنیا ئەمڕۆ بەکار هات کە من نیمە.

لە کتێبی: زایەڵەی زرێبارەوە وەرگیراوە



